ناوی کتێب: سیاسەتی پەرەپێدانی نەوتی خاو و گازی سروشتی لە هەرێمی کوردستان

نوسەر: د.قەیوان سوارە محمد امین

بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو راگەیاندن/ هەولێر

نەخشەسازی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە

خەت: نەوزاد کۆیی

بەرگ: أمین مخلص

نۆرە و ساڵی چاپ: دوەم ١٤٣٢ک - ٢٠١١ز

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ١٥٦٧ ) ی ساڵی ٢٠٠٨ دراوەتێ



بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاص
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

سیاسەتی پەرەپێدانی

# نەوتی خاو و گازی سروشتی

لە هەرێمی کوردستان

نوسینی

د. قەیوان سوارە سیوەیلی



“پێشکەش بە باوکی سەربەرزم،
کاک سوارە محمد أمین ئاغا، کە
هیچ کات لە هیچ قۆناغێکی ژیانیدا
لە بەرەی خزمەت بە گەل و
خاکەکەی لای نەدا”

# پێشەکی

لەم پەرتوکەدا خوێنەر بە گشتی و کاربەدەستانی رامیاری وڵات بە تایبەتی دەبێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بدۆزنەوە کە  چۆن ئێمە لە هەرێمی کوردستاندا بۆ بوژاندنەوەی گشت لایەنە ئابوری، کۆمەڵایەتی و دوبارە دارشتنی ژێرخانی دارماوی ئابوری وڵات سود لە نەوت و گازی سروشتی وەربگرین! کە چۆن ئێمە لە هەرێمەکەماندا سامانی سروشتی نەوت وگاز بکەینە بنەمای پایەداری و جێگیری هەرێمەکەمان لە ناوچەکەدا و گەلەکەمان لە نەهامەتیەکانی رابوردوو دوربخەینەوە.

وزە توانایی راپەراندنی هەرکارێکە لە گشت سیستەمەکاندا. وزە بە پایەیەکی گرنگی ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکان ناودەبرێت، گیاندارەکان و شینابیش هەروەها بۆ پەرەپێدان بە ژیانی رۆژانەیان سود لە وزە وەردەگرن. بۆ ئاسودەی ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکان لە رۆژانی ساردی زستاندا وزە دەکرێتە گرمایی و لە گەرمای هاویندا وزە دەبێتە ساردی نێو خانوبەرەکان. وزەی ساردی و گەرمی لە دوا قۆناغی کۆتایی وزەگۆرکێدان.

نەوتی خاو و گازی سروشتی یەکێکن لە هەرە گرنگترین سەرچاوەکانی وزەسەرەتایەکانی نێو ئەم کەونە خاکییەی خۆمان. هەروەکو چۆن لە سەدەی نۆزدەهەم دا خەڵوزی ڕەش و قاوەیی بەردین دەورێکی شیاوی لە شۆڕشی پیشەسازیدا گێڕا وە پاشان لە سەدەی بیستەمدا نەوتی خاو جێگەی گرتەوەو گاریگەری بەرچاوی لە نێو گشت هاوکێشە ڕامیاریە ئابورییەکاندا هەبوو، بە هەمانشێوەش گازی سروشتی لە سەدەی بیستویەکەمدا شانبەشانی نەوتی خاو دەوری خۆی لە دابینکرنی توانا بۆ پیشەسازی دەبینێت.

ئەوە سەدسالێکە کە نەوتی خاو و گازی سروشتی بە شێوەیەکی پیشەسازی لە ژێر زەوییەوە هەڵدەهێنجرێن و هێشتا بە ڕێژەی ٨٠% گرنگترین کانزای سەرەتاین بۆ وەرگێرانی وزە لە سەرتاسەری جیهاندا، کە تائەمڕۆکەش تەکنۆلۆجیا و ژیانی شارستانی بە بێ ئەو وزانە هیچ مانایەک نابەخشی. تا ئەمڕۆکەش هیچ کانزایەکی سروشتی تر بەدی ناکەین وەکو نەوتی خاو کە ئاوەها دەوری سەرەکی لە کاروبای ئابوری، سیاسەتی وڵاتان و پەیوەندی نێوانیان بینیبێت و ئاوەها لەلایەکەوە بەردی بناغەی پیشکەوتن و شارستانیەتەو لە لایەکی ترەوە دەوری سەرەکیشی لە گشت شەڕەکاندا گێڕابێت.

لەپاش هەڵهێنجانی ١٠٠ ساڵەی نەوتی خاو و وەرگێڕانی وزەیەکی بێئەندازە لە نێو گشت وڵاتەکانی خاوەن نەوت و گازی سروشتی لە سەرتاسەری جیهاندا دیاردەی گەیشتن بە ترۆپی دەرهێنان (Peak Oil) ئەمڕۆ شتێکی حاشاهەڵنەگرە، واتە بەهۆی دەرهێنانی سامانی ژێرخانی نەوت و گازی سروشتی لە وڵاتەکەیاندا زەخیرەکانی ژێرزەوی ئەم کانزایانە نیوەیی بون و بەرەوکەمبون و نەمان دەچن. هەرێمی کوردستان تاکە هەرێمێکە لە نێو ئەم گشت وڵاتەخاوەن نەوتانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە چاڵە نەوتی و گازی سروشتیەکانی بەدەستلێنەدراوی و پڕی مابێتەوە.

نەوت و گازی وڵاتە ئەوروپاییەکان تا دەساڵێکی تر و ئەمریکا تا چەند ساڵێکی تر و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا ٦٠ ساڵی‌تر بەرگەی ئەو گشت کەڵک لێوەرگرتنەی تەکنۆلۆجیای پێشکەوتو دەگرن. بەڵام لە بەر دەستلێنەدراوی و پڕی چاڵە نەوتەکانمان، ئێمە لە هەرێمی کوردستاندا تا ٢٠٠ ساڵی دی خاوەنی نەوتی خاوی سوک و گازی سروشتی شیرینی هەرزانین. هەربۆیەش بەسەرنجەوە لەلایەن وڵاتە پیشەسازیەکانەوە دەوترێت کە نەوت و گازی سروشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بۆ ئەوە هەڵدەهێنجرێت تا تونێتی وزەی وڵاتانی ڕۆژئاوای پیشەسازی بشکێنێ.

لە پاش سەدساڵەی دەستبەسەراگرتنی نەوتی هەرێمی کوردستان لەلایەن حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی مەرکەزییەوە و ڕێگەیاَن گرت لەوەی کە تەکنۆلۆجیای هایدرۆکاربۆنەکان لە هەرێمی کوردستاندا پەرەبستێنێت، ڕێگەیان نەدا کادیرەکانمان شارەزابن، هەربۆیەش دەبێت حکومەتی هەرێمی کوردستان گرنگی بەوە بدات کە خودییخۆمان لە هەرێمی کوردستانی خۆماندا وزەی پێویستی وڵات وەربگێڕین و بە هیچ دراوسێییەکمانەوە وابەستە نەبین.

واتە وزەکەمان هەڵقوڵاوی ئەم دەڤەرەبێت و نەبێتە هۆی پیسبونی ژینگەکەمان و نەکرێتە کارتێکی فشاری ڕامیاری لەلایەن دراوسێکانمانەوە.

وزەی هەڵبژێردراویش بە نرخێکی کەم و ئابوریانە هەمیشە لەگەڵ هەڵکشانی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان لە ژینگەیەکی پاکدا لە هەر وەرزێکی گەرم یاخود ساردی ساڵدا جوابگۆی گشت خواستەکانی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان و پیشەسازی وڵات بێت.

لەو ڕوانگەیەیی کە لە وڵاتەکەماندا بە شێوەیەکی شایستە خاوەنی وزەیەکی بێئەندازەی وزەنوێبوەکانین، بەتایبەتی ئاو و تیشکی ڕۆژ، بۆیە دەبێت هەوڵبدرێت زۆربەی وزەی کارەبای وڵات لەم سەرچاوانەوە

وەربگێڕدرێن، چونکە هەڵقوڵاوی ئەم خاکەی خۆمانن و هەتاهەتایین، تا ڕێگە لە سودوەرگرتنی وەرگێڕان و سوتاندنی وزەی گشت کانزا فۆسیلیەکان بگیرێت و کە پاشان ڕێژەی ئاوەڵابونی گازی دیئۆکسیدی کاربون $CO_2$ کەم بکرێتەوە.

سەرەڕای ئەمانەش بەهۆی سودوەرگرتن لە وزەی وزەنوێبوەکانەوە دەتوانین شوێنی کار بۆ کۆمەڵێکی باش لە دانیشتوانی وڵات دابینبکەین.

هەرێمی کوردستان ئێستا لە ئێراقی فیدرالی نوێدا بەفەرمی خاوەنی سەرچاوەکانی وزەی کانزا فۆسیلیەکانیشە، بەتایبەتی نەوتی‌خاو لەگەڵ گازی سروشتی، هەربۆیەش دەبێت بۆ سەقامگیرکردنی ژێرخانی ئابوری سود لە گرانی ئەم وزانە لە پاش فرۆشتنیان لە نێو بازاڕەکانی دونیادا وەربگیرێت و توانای وەرگێرانی ئەم وزانە بۆ بەرهەمە پترۆکیمیاویەکان پەرەپێبدرێت و بە شێوەیەکی سەرەکی بەرهەمەکانی نەوتی‌خاو گازی سروشتی بخرێتە نێو بازاڕەکانی دونیاوە، نەک بەو ئامانجەی ئەم کانزایانە بە خاوی و لە دۆخی سروشتیدا بفرۆشرێن.

لە کاتی داڕشتنەوەی ژێرخانی ئابوری وڵات ئەو بابەتە ڕچاو بکرێت کە ئەم جۆرە وزانەی سەرچاوە فۆسیلیەکان هەتاهەتایی نین و لە بڕهاتون و کارێک نەکەین کە ئابوری

وڵاتمان لەسەر بەروبومی فرۆشتی ئەم وزانە بە شێوەی خاو بۆ ماوەیەکی دورودرێژ دارێژین، بەڵکو سەرچاوەی ئابوری وڵات دەبێت هەڵقوڵاوی بەرهەمی بیروهۆشی گشت کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بێت.

خوێنەری بەڕێز ئەم پەرتوکە لە حەوت بەش پێکدێت لە بەشی یەکەمدا پێناسەی جۆرەکانی وزە دەکرێت، پاشان هۆکاری ڕامیاری دونیای وزە شیدەکرێتەوە و گفتوگۆ لە سەر مێژووی نەوت وگاز دەکرێت لە ئێراقدا. لە بەشی چوارەمدا لە چۆنێتی بەرزبونەوەی نرخی نەوت دەکۆڵرێتەوە و پاشانیش شرۆڤەی بنەماکانی دارشتنی گرێبەستە نەوتیەکان دەکرێت و لە بەشی شەشەمدا تەکنۆلۆجیای پیترۆکیماوی شیدەکرێتەوە و لە بەشی کۆتایدا باسی چۆنێتی پاراستنی ژینگەی وڵاتەکەمان دەکرێت کە ئەم بەشە دەبێت لە کاتی بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز دا گرنگیەکی زۆری پێبدرێت.

لە هەمانکاتدا ئەم پەرتوکە بەرهەمی کۆکراوەی کۆمەڵە وتار و زانیاری یەکە کە لە کاتی لێکۆڵینەوە و کارکردنمدا لە بواری نەوت وگازی سروشتی لە هەندەران و کوردستاندا بەدەستم هێناون.

ئاشكرایە بە هۆی سیاسەتی چەوتی ڕژێمە یەك لەدوای یەكەكانی ناوەندی بەغداد بە گشتی و سیاسەتی شۆڤێنی دەیان ساڵەی ڕژێمی بەعسی بەتایبەتی، وایان كردبوو كە گەیشتن بە زانیاری لە بواری نەوت و گازی سروشتی لە نێو وڵاتی ئێراقدا وە بەتایبەتی لە هەرێمی كوردستاندا بە زبانی كوردی زۆر دشوار بێت. بەڵام لەم پەڕاوەدا هەوڵدراوە كە زۆربەی ئەو زانیاریانەی، كە لەماوەی خوێندن، كاركردنمدا و لە ئەزمونی مرۆڤە شارەزاكانی نێو بواری نەوت وگازی ئێراق و ئەوروپا وەرگیراوە، بگەیەنمە دەستی خوێنەرانی هەرێمی كوردستانی خۆشەویست.

بۆیە ئاواتم ئەوەیە كە بەدڵی گشت خوێنەرێكی كوردزبانی بەڕێزبێت.

د. قەیوان سوارە سیوەیلی

هەولێر ٢٠١٠

# ناوەرۆک

## ١. پێناسەی جۆرەکانی وزە

لەبەر ئەوەی کە بڕو جۆری وزە پەیوەندیەکی لێکنەپچڕاوی بە گشت تاکەکانی کۆمەڵگا و گشت بەرپرسیارانی سیاسی وڵاتەوە هەیە، بۆیە پرسیارەکانی وزە، دابینکردنی و بڕی پێویست بۆ کۆمەڵگا لەمڕۆکەو داهاتوشدا یەکێکن لە هەرە پرسیارە گرنگەکانی نێو بنکە لێکۆڵەرەوە ڕامیاریەکانی جیهان. پرسیاری ئایا کام یەک لە جۆرە وزەسەرەتای یەکان ئابورین و جوابگۆی گشت خواستەکانی کۆمەڵگای کوردەواری ئێمەن؟ و خۆماڵی و لە وڵاتەکەی خۆماندا هەڵقوڵاوبن؟ کە بەهۆیانەوە لەلایەن وڵاتانی دراوسێمانەوە ناخرێینە ژێر پاڵەپەستۆی ڕامیاریەوە! بەکورتی واتە کوردستانین؟؟؟، یەکێکدەبن لە گرنگترین پرسیارکانی ئەمڕۆکەی وڵات، کە دەبێت مرۆڤە ڕامیاریەکانی هەرێمەکەمان وەڵامێکی بەجێی بۆ بدۆزنەوە.

لە ناوەرۆکی ئەو وەڵامەشدا پێویستە لە نێوان گشت وزەسەرەتاییەکاندا وزەیەک هەڵبژێردرێت کە لە داهاتوشدا جوابگۆی خواستەکانمان بێت و لە ڕاستای هێشتنەوەی ژینگەی پاکی کوردستان بێت. هەر وزەیەکی سەرەتایی هەڵبژێردراو بۆ وڵاتەکەمان دەبێت لەو سێ خاڵەی خوارەوەدا دەقاودەق پەسندکراو بێت:

- کوردستانی بونی وزەکە،

- نەبێتە هۆی پیسبونی ژینگە،
- لەگەڵ دڵنیایی و سەقامگیری وزەکەی (واتە بەردەوامییپایەدار) پێویستە لە لایەن ئابوریشە وە هەرزان بێت.

لە نێو پسپۆڕانی بواری ژینگەو وزە دا چمکی بەردەوامییپایەدار بۆ سود وەرگرتن لە وزەو ژینگە (Sustainable Development) پێناسە دەکرێت، لێرەدا شیکردنەوەی ئەو چمکە بەهۆی بواری ئابوریەوە ئەو واتایە دەبەخشێت: کە مرۆڤ پێویستە کەڵک لە بەرهەمەکانی وەچنگهاتو لە سەرمایەکە (واتە ژینگە یاخود هەر سامانێکی سروشتی بڕهاتو (نەوتی خاو)) وەربگرێت، نەک بکەوێتە سودوەرگرتن و خەرجکردنی خودی سەرمایەکە. واتە مرۆڤ ئەگەر سودی لە خودی سەرمایەکە وەرگرت ئەوا لە سەر حسابی نەوەکانی داهاتو بە بیرێکی ئابوری دۆڕاو پەرە بە ژیانی دەدات. مرۆڤ لە نرخی سەرمایەیەک (بۆ نمونە: نەوتی خاو) دەخوات کە دەبێت لە دوارۆژدا نەوەکانی داهاتو بچنە ژێر باری زەرەرو زیانەکانیەوە.

لە لێکدانەوەی کانزا سەرەتاییەکان بەگشتی و کانزافۆسیلیەکان بەتایبەتی پێویستە لە سەرەتادا گشت قۆناغەکانی وزەوەرگێڕانیان پێناسە بکەین. ئێستا لە وێنەی خوارەوەدا ١.١ زنجیرەی سودلێوەگردنی وزەی نێو مادە فۆسیلیەکان بە گشت ئاڵۆزی بوارەکانی ڕوپێووکردن

(Exploration)، دەرهێنـــان (Production)، گواســـتنەوە (Transportation)و پاشـان پالاوتن (Refining) و وەرگێـڕان (Conversion)بـــۆ وەچنگخســـتنی وزە (Energy) و بەرهـــەم (Product) ڕونکراوەتەوە.






دایەگرامی ١.١: گشت قۆناغەکانی بەرهەمهێنانی وزەی نێو کانزا فۆسیلیەکان

لـــە دایـــەگرامی ١.٢ ی خـــوارەوەدا بـــڕی ڕێـــژەی وزەی ســـەرەتایی وەرگێـڕدراوی پێویســـتی ڕۆژانـــەی گشـــت جیهـــان دەستنیشان کراوە.




دایەگرامی ١.٢: وزەی وەرگێڕدراوی پێویستی گشت جیهان []

هەروەکو ئاشکرایە زۆربەی وزەی دونیا لە وزەی سەرەتایی نێو مادە فۆسیلەکانەوە (گازی سروشتی، نەوتی خاو، خەڵوزی بەردین) وەردەگێڕدرێت. وەرگێڕانی وزەش بۆ گشت بەشە گرنگەکانی پیشەسازی، کشتوکاڵ، وزەی پێویستی هاوڵاتیانی لە خۆگرتووە. وەرگێڕانی وزە بە هۆی وزەی ناوەکییەوە (Atomic energy) بەشێکی زۆرکەمی پێبەخشراوە. بە شێوەیەکی گشتی لە بواری وەرگێڕانی وزەی کارەبادا سود لە وزەی ئەتۆمی وەردەگیرێت. لە بەشی ئەوانی دیکەدا (Others) زۆربەی زۆری وزەی وەرگێڕدراوی نێو وزەنوێبوەکانی لە خۆگرتووە.

بەگشتی وزە سەرەتاییەکان بریتین لەو جۆرە وزانە کە لە سروشتدا بە شێوەیەکی خاو بونیان هەیە.

وزەسەرەتایەکان لەم چەند خاڵەی خوارەوە دا خراونەتەڕوو:

١. کانزافۆسیلیەکان:

- خەڵوزی بەردین (خەڵوزی قاوەیی، خەڵوزی ڕەش) (Caol)
- نەوتی خاو (Crude Oil)
- گازی سروشتی.(Natural Gas)

٢. وزەی ناوکی، بەناوبانگتریان وزەی ناوکی یۆرانیۆمە $U_{235}$.(Atome Energy)

٣. وزەنوێبوەکان .(Renewable Energy)

وزەنوێبوەکانیش بریتین، لە وزەی ڕاستەوخۆی درەوشاوەی خۆر (کە لە بنەڕتدا سەرچاوەی گشتییانە Direct Sun light)، وزەی سەوز (بیۆماسە Biomass)، وزەی با (Wind energy، وزەی پۆتێنسیالی ئاو (Potential Energy) و جوڵەوزەی ئاو (Kinetc Energy)، وزەی شەپۆلەکانی ئاو و هەروەها لەگەڵ وزەی گەرمی ژێرزەوی (Geothermal Energy. تا سەرەتاکانی شۆڕشی پیشەسازی (Indusrtail Technology) وزەی وزە نوێبوەکان (داری وشک، ئاو و با) تاکەسەرچاوەی وزەی مرۆڤەکان بون لەسەر ڕوی زەوی.

سودوەرگرتن لە وزەی خەزنکراو لە هەڵمی ئاودا بۆ وەچنگخستنی وزەی میکانیکی بۆ وەگەرخستنی ئامێرەکان (گواستنەوە) بوەهۆی بەرپابونی شۆڕشی پیشەسازی و سەرئەنجامی هەڵلوشنی وزەیەکی بێئەندازەی سەرەتایی

بەتایبەتی لە سەرەتادا خەڵوزی بەردینی لێکەوتەوە. کە ئەم هۆکارە بوە هۆی وەلاوەنانی داری سوتاندن وەکی کۆنترین وزەی سەرەتایی.

لە وێنەی ١.٣ دا گشت جۆرەکانی وزە بە گشتی دەستنیشان کراوە. ئاستی ژیان و خۆشگوزەرانی هەر ئادەمیزادێک لە سەر ڕوی زەوی پەیوەندی بە بڕی سودوەرگرتنی ئەم وزانەوە هەیە.




وێنەی ١.٣: گشت جۆرەکانی وزە بە شێوەیەکی گشتی

ڕۆژ لــە دوای ڕۆژ مرۆڤــەکان بــەئارەزوی گەیشــتن بــە ژیــانێکی باشــتر و بەرهــەمی زێــدەتر لــە کارگەکانیانــدا و چڕکردنــەوەی ســەرماییــەی تایبــەتی خۆیــان لــە هــەوڵی کۆنترۆڵکردنی وزەیەکی سەرەتایی بە چڕیەکی زۆر (وەکی نەوتی خاو یان وزەی ناوەکی) دابوون.

لە سەرەتاکانی شۆڕشی پیشەسازیدا بەهۆی سودوەرگرتن لــە وزەی خــەڵوزی بەردین مرۆڤــەکان بەتایبــەتی و ژینگــەش بەگشــتی توشــی کۆمەڵــە گرفتێــک هــاتن. هــەر لەبــەر ئــەم هۆیانەش بو کە بەئارەزوی وەچنگ خستنی وزەیەکی چڕتر لێکۆڵینەوەکانیان ئەنجام دەدا، تا ئەوکاتەی کە نەوتی خاو وە پاشانیش وزەی ناوەکی و گازی سروشتی هاتە نێو بازاڕی وزە سەرەتایەکانەوە.

لە وێنەی خوارەوەدا گشت شێوەکانی وزە سەرەتاییەکان و چــــۆنێتی ســــــودوەرگرتن و وەرگێڕانــــــی وزە لــــــە وزەســەرەتایەکانەوە بەگشــتی لــە ســەر ڕوی زەوی لــە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٠٠ وە تا داهاتویەکی دور دیاریکراوە. هــەروەها لــەم وێنەیــەدا ڕێــژەی سودلێوەرگرتنی ئــەم وزانــە وەکو بەراوردێک دێتەپێش چاو.




وێنەی ١.٤: وەرگێڕانی وزە لە سەر ڕوی زەوی
لە ماوەی چەند سەدەدا [٩]

لە سەرەتادا وزەی گشتی ڕوی زەوی لە ئەنجامی وەرگێڕانی وزەی وزەنوێبوەکانەوە سەرچاوەی دەگرت، واتە تەنها لە تینی درەوشاوەی تیشکی خۆر و سوتاندی دارەوە (وزەی سەوز) وزە، وەردەگێڕدرا. پاشان چەند سەدەیەک لە پاش شۆڕشی پیشەسازی لە وڵاتە پیشەسازیەکاندا بۆ وەگێڕانی وزە سود لە خەڵوزی بەردین وەردەگیرا، تا ئەوکاتەی نەوت و گازی سروشتی و وزەی ناوەکی هاتنە نێو بازنەی وەگێڕانی وزەوە و لە زۆر شوێنی دونیا دا تا ڕادەیەک جێگەی خەڵوزی بەردینیان گرتەوە.

هەربۆیەش نەوتی خاو لەگەڵ گازی سروشتی گرنگترین وزەی سەرەتایی ئەمڕۆکەی ئێمەن، چونکە زێدەتر لە ٨٠% گشت وزەی سودمەندی ئەمڕۆکەی ئێمە بەهۆیانەوە وەردەگیرێدرێت.

هەرچۆن کە لە وێنەی ١.٦ دا دێتە پێش چاو، ئەوە نزیکەی سەد ساڵێکە کە مرۆڤەکان لە وزەی وەرگێڕدراوی نەوتی خاو سود وەردەگرن، سەرەتا گازی بنزەوی بە بەرهەمێکی بێکەڵک پێناسەدەکرا، بەلام پاش پێشکەوتی تەکنۆلۆجیاو دۆزینەوەی چارەسەری چۆنێتی گوێزانەوە بە هۆی بۆری تایبەتی (Pipeline) و دۆخی شلیەوە (LNG)، ئەویش هاتە نێو بواری وزە گۆڕکێ و سودمەند بوو.

لە دونیای ئەمڕۆدا ئەم دوو مادەفۆسیلیە لە گشت بوارەکانی، گواستنەوە، بەدەستهێنانی گەرما، وەرگێڕانی وزەی کارەبا Electric Energy و بواری ئامادەکاری تەکنیکی Process Engineering و پیترۆکیمایی Petrochimical Industrie سودیان لێوەردەگیرێت.

گشت وزەسەرەتاییەکانی مادە فۆسیلیەکان لە ئەنجامی پاشەکەوتکردنی وزەی تیشکی خۆرەوە لە ماوەی ملیۆنەهاساڵی تەمەنی زەویدا هاتونەتە ئاراوە.
بەلام بە خێرایەکی بێئەندازە ئەوبڕەی کە لە ساڵێکدا دەسوتێنرێن، بۆ هەمان بڕی سوتێنراو ملیونەها ساڵ پێویستە تا لە ناخی زەویدا دروست ببنەوە و جێگەکەی

پڕببێتــەوە، کەواتــە هــا ڕۆژێـک هــات کــە کۆتایــان دێـت.
هەربۆیـــەش ئـــەم جـــۆرە وزە ســـەرەتاییانە مـــۆرکی
هەتاهەتاییان پێوەنییە(Limited).

بـەڵام تـەکنۆلۆجیای ئـەمڕۆمان تـا سـەر ئێسقان بـە وزەی
نێـو سـامانە سروشـتی یــە هایدرۆکاربۆنەکانــە وە بەنــدە.
هەروەکو چۆن لـە هێڵکاری خوارەوەدا ١.٥ دەردەکـەوێت تـا
ساڵی ٢٠٣٠ یـش ئـەم پابەنـدی یـە سـاڵ لـەدوای سـاڵ
بەرەوسەرێ هەڵدەکشێت.




هێڵکاری ١.٥: وزەی پێویستی جیهان لە ماوەی ٦٠ ساڵدا [١٨]

بە هەمان شێوەش وزەی داهاتوی کۆمەڵگاش هەر لە ڕێی کانزافۆسیلیەکانەوە دابیندەکرێت. نەوتی خاو گەورەترین بەشی دابینکردنی وزەی پێدەبڕێت و پاشان گازی سروشتی دێت کە لە ئایندە بەشێوەیەکی خێرا بڕی سودلێوەرگرتنی بەرەوسەرێ هەڵدەکشێت. بڕی سودلێوەرگرتنی خەڵوزی بەردینیش بۆ وەرگێڕانی وزە بە هەمانشێوەی گازی سروشتی بەرەوسەرێ هەڵدەگەڕێ.

بە هۆی هێڵکاری ١.٦ وە گێژاوی وزەی نێو جیهانی پیشەسازی زیاتر ڕوندەبێتەوە، واتە: تاکە وزەیەک کە ساڵ لە داوی ساڵ لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیاو خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان بەرەوسەرێ هەڵکشێت، تەنها وزەی وەرگێڕدراوی نێو سەرچاوە هایدرۆکاربۆنییەکانە.

لەگەڵ بەرەوسەر ڕۆشتنی وزەی وەرگێڕدراو لە سەرچاوە هایدرۆکاربۆنییەکانیش وزەی وەرگێڕدراوی نێو وزەنوێبوەکان و وزەی ناوەکی بەشێوەیەکی ساکار بەرەوسەرێ هەڵدەگەڕێن، بەڵام ئەمانە وەڵامدەرەوەی گشت خواستەکانی نێو تەکنۆلۆجیای جیهان نین.

لە هەمان کاتدا هێلکاری ١.٦ کە کاتی سودلێوەرگرتنی وزەی مادەفۆسیلیەکانمان لە ماوەی ٢٥٠٠ ساڵدا بۆ ڕوندەکاتەوە، بەو ڕاستیە دەگەین، کە ماوەی کاتی سودلێوەگرتنی ئەم مادەفۆسیلیانە لەبەراورد لەگەڵ ماوەی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر ڕوی زەوی و سود وەرگرتنی مرۆڤ

لە وزە سەرەتایەکانی دی ماوەیەکی زۆر کەمە، بۆیە نابێت ئێمەش لە وڵاتی خۆماندا چوارچێوەی ئابوری و وزەی وڵاتمان لە سەر ئەم جۆرە وزە سەرەتاییانە بونیاد بنێین. ئەمەیە ئەو گێژاوەی کە تەکنۆلۆجیای ئەمڕۆی ئادەمیزاد پێوەی ئاوقە بووە.




دایەگرامی ١.٦: بەرهەمهێنانی وزەی نەوت
لە ماوەی ٢٥٠٠ساڵی ژیانی مرۆڤدا

بەتایبەتی لە داهاتودا بەهۆی ئاسانی لە کاری گواستنەوە (Transportation) و پاشەکەوتکردنی (Storge) گازی سروشتی لە دۆخی شلی دا و بەگشتی پاکیژەیی بۆ ژینگە لە ئەنجامی وزەگۆڕکێدا، گازی سروشتی کەمکەم بۆ دونیای پیترۆکیمیاوی پێگەیەکی باشتری لە نەوتی خاو پێدەدرێت.

وزەی ئەتۆمیش جگە لە بڕهاتویی کانزای یۆرانیۆم وەکو مادەفۆسیلیەکان کە لە داهاتویەکی دەیان ساڵێکدا ئەویش لەبڕدێت، لە بەر ئەوی تا ئەمڕۆش گرفتی شاردنەوەی پاشماوەی پڕ تیشکاوی (Radioactive Material) کانزای بەرهەمهاتوی پاشماوە لە ئەنجامی وزەگۆڕکێدا، چارەسەر نەکراوە، و پێویستیەکی زۆری مادی و مەعنەوی بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەم وزەیە، بونەتە و لە داهاتوشدا دەبنە بەربەستی جێگیرنەبونی ئەم وزەیە وە وەکو وزەیەکی جێگیر بۆ دوارۆژی مرۆڤایەتی.

سەرئەنجام لە داهاتودا کاتێک کە گشت وزەسەرەتاییەکان (مادەفۆسیلیەکان، وزەی ئەتۆمی) دواییان هات، تاکە ڕێگە بۆ وەچنگخستنی وزە تەنیا وزەی وزە نوێبوەکان (واتە وزەی باو، ئاو، وزەی سەوز و وزەی درەوشاوەی تیشکی خۆر) دەبێت. وەلە داهاتودا دەتوانرێت لە وزەی ئەم وزەنوێبوانەوە، گازی هایدرۆجین ($H_2$) پاشەکەوت بکرێت و وەربگێڕدرێت و گازی هایدرۆجین وەکو سەرچاوەیەکی نوێ بۆ وەرگێڕانی وزە سودمەند بکرێت.

بۆ زانیاری زیاتر لە بواری وزەدا تکایە بڕواننە پەرتوکی **"چەند لێکۆڵینەوەیەک لە بواری سیاسەتی دابینکردنی وزەو پاراستنی ژینگە لە کوردستاندا"** کە لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٨ لە شاری هەولێر بڵاومکردۆتەوەو لە نوسینگەی تەفسیر لە چاپ دراوە [١٧].




وێنە ١.٧: بەرگی کتێبی "چەند لێکۆڵینەوەیەک لە بواری سیاسەتی دابینکردنی وزەو پاراستنی ژینگە لە کوردستاندا

## ١.١ گرفتی نێوان کەمی کارەبا و وزەی گەرمایی نێومالان لە هەرێمی کوردستاندا

بە بەردەوامی بەهۆی هاتنی وەرزی ساردی زستان گرفتی هاووڵاتیان و لێدوانی نێوانیان دوبارە لەو بوارانەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئایا ئەم ساڵ گەرمای پێویستی نێوماڵ بەهۆی چ وزەیەکەوە دابین بکرێت. زۆربەیان خۆشحاڵن کە تارادەیەک ئاستی وەرگێڕانی وزەی کارەبا بەرەوسەرێ هەڵکشاوەو، دەتوانێری لە لایەن زۆربەی هاوڵاتیان بەهۆی سودوەرگرتن لە هیتەرو و لەلایەن بەشێکی کەمیشەوە بەهۆی سپلیتەکانیشەوە دوبارە گەرمای نێومالان دابینبکرێت!

یاخود لە ڕێگەیەکی تروە بەشێوەیەکی کلاسیکی وەکو جاران بۆ گەیشتن بە وزەی گەرما سود لە داری وشک یان عەلادین و زۆپای نەوتی وەربگرن؟

بیرکردنەوە لە هەڵبژاردنی یەکێک لە ئەم دوو ڕێگەیە بەواتای داڕشتنی سیاسەتی وزەی وڵات دێت. چونێتی وەرگێرانی وزەی وڵات و گەیشتین و ڕێگەی گەیشتن بە بەرهەمەکانی وزە جا ئەم وزەیە چ بەرهەمەکانی نەوت یاخود کارەبا یاخود گەرمایی نێو مالان بێت، ئەمانە خۆی لە بواری سیاسەتی داڕشتنی وزەی وڵاتدادەبینێتەوە، کە دەبێت لەلایەن کاربەدەستانی ڕامیاری وڵاتەوە بیری

لێبکرێتەوە و ڕێچکەی بۆدابڕێژرێت. یاخود ئەمە کاری ئەو وەزارەتە پەیوەندی دارانەیە کە چوارچێوەی کاریان بواری وزە دەگرێتەوە کە لە هەرێمەکەماندا وەزارەتی سامانە سروشتییەکان و پاشان وەزارەتی کارەبایە. ئەم دوو وەزارەتە دەبێت سیاسەتی وزە و ڕێچکەی چونێتی گەیشتن بە وزەی سودمەندی وڵات دارێژن.

١. سەرتا بابزانین وزەی گەرمی نێو وڵاتمان لە چ ڕێگەیەکەوە بەرهەم دەهێنرێن.

a. لە سەرەتای خولْقاندنی مرۆڤەوە تا ساڵانی ڕابوردو سود وەرگرتن لە سوتاندنی داری وشک بۆ بەرهەمهێنانی وزەی گەرمی نێو ماڵان سەرەکیترین هەنگاوی گەیشتن بە وزە بوو، کە ئەمەش لەڕوانگەی ژینگەوە باشترین شێوەی گەیشتن بەگەرمایە لە سەرتاسەری دونیادا و زۆربەی وڵاتانی ئەوروپایی ئێستا دوبارە ڕوو لەم هەنگاوە دەکەن. بەڵام بەهۆی کەمی دارستان و داڕوتانی دارستانەکانی نێو کوردستان ئەم دیاردەیە دەبێت قەدەغە بکرێت.

b. بە هۆی زۆپای نەوتەوە (Kerosene Heaters) دەتوانین بەشێوەیەکی ساکار گەرمای نێو ماڵەکانمان دابینبکەین. واتا لەیەک قۆناغدا دەتوانین نەوتی سپی بۆ گەرما وەربگێڕین. کە ئەمە لە ئەمڕۆدا بەهۆی مۆدێرنبونی تەکنۆلۆجیای زۆپاکانی سوتاندنی نەوت لە کوردستاندا

باشرتین شێوەی گەیشتن بە وزەی گەرمای نێو وڵاتە، چونکە وزەی بەفیرۆچوو لەم بوارەدا زۆر کەمە.



وێنە ١.٨: ئامێرەکانی وەچنگخستنی گەرمی نێو ماڵان

٢. ئەی وزەی کارەبای نێو وڵاتمان لە چ ڕێگەیەکەوە بەرهەم دەهێنرێن و چۆن لەو ڕێگەیەوە بە گەرمای نێو ماڵان دەگەین.

لە ساڵەکانی ١٩٩١ وە بەنداوەکانی دوکان و دەربەندیخان سەرەکیترین وێستگەی بەرهەمهێنەری کارەبای کوردستان بوون کە بەهۆیانەوە وزەی پوتێنسیالی ئاو بۆ کارەبا وەردەگێڕدرا. بەداخەوە بەهۆی کەمی ئاو نێویان لە ئەنجامی وشکەساڵی و کەمی باران، وەرگێڕانی وزەی کارەبا لەم دو وێستگەیەوە بە نزمترین ئاستی خۆی

گەیشتوە، کە ئێستا ئەم دوو بەنداوە بەهۆی پێویستی زۆری کارەبا لە وڵاتدا هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆیان لەسەر دابینکردنی وزەی وڵات نەماوە. چونکە وەرگێڕانی کارەبای وەرگێڕدراو لە وزەی پۆتێنسیالی نێو بەنداوەکان باشترین سەرچاوەیە بۆ وزەی گەرمای نێو ماڵان، هەروەکو چۆن لە وڵاتانی نەرویج و سویسرا سودیان لێوەردەگیرێت.

بەشێوەیەکی گشتی ئێستا گازوائیل و پاشان بەنزین و وەکو بەرهەمەکانی نەوتیخاو و گازی سروشتی ئەو وزە هایدرۆکاربۆنیە سەرەتاییانەن کە بەهۆیانەوە وزەی کارەبای وڵات بەرهەمدەهێنرێن. بۆ نمونە لە هێڵکاری خوارەوەدا گشت قۆناغەکانی وەرگێڕانی وزەی کارەبا بەهۆی وێستگەی گازی سروشتی، گواستنەوی وزەی کارەبا تا نێو ماڵی هاوڵاتیان شیکراوەتەوە.




وێنەی ١.٩: زنجیرەی پێکەولکێنراوی وەرگێڕان و گواستنەوەی وزەی کارەبا

کەواتە بۆ گەیشتن بە وزەی گەرمایی نێو ماڵان بەهۆی کارەباوە دەبێت سەرەتا لە نێو وێستگەی گاز تۆربایینەکاندا گازی سروشتی بسوتێندرێت و پاش بەفیڕۆچونی نزیکەی لە سەدا ٦٥%ی، وزەکەی وەربگێڕدرێت بۆ کارەبا پاشان لە گواستنەوەیدا بەهۆی هێڵی کارەبای ڤۆڵتیەی بەرزەوە کە ئەمیش پاش بەفیڕۆچونی بەشێکی تری، وزەی کارەبا بگەیەنرێت بۆ نێو شارەکان و کە دواجار گوێزانەوەی بۆ نێو ماڵی هاوڵاتیان وەکو وزەی سودمەندی کارەبا. تا گەیشتن بەم قۆناغە نزیکەی زۆرتر لە ٧٠%ی وزەکەی بەفیڕۆچووە.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کارەبا پاکوخاوێنترین وزەیە. تایبەتمەندی کارەبا لەوەدایە کە دەتوانرێت بە ساکاری بۆ ڕوناکی یا خود بۆ هێزی نێو مەکینەکان و ئامێرەکانی نێومال وەربگێڕدرێت بەبێ ئەوەی هیچ پاشماوەیەکی لەدوادا بەجێ بمێنێت، نەک بۆ وەچنگخستنی وزەی گەرما.

ئێستا هاوڵاتیان دەچن ئەم وزە کارەبایە بەهۆی ئامێرەکانیانەوە وەردەگێڕن بۆ گەرما. کە ئەم کارە لەم ڕۆژەدا کە کارەبا زۆر نایاب و گرنگە بۆگشتمان کارێکی شیاو نی‌یە.

چونکە ئەگەر لە کارەبا وزەی گەرمی وەربگێڕین ئەوا خۆنەویستانە هاوکێشە فیزیایەکانمان بەرەو دوا وەرگێڕاوەتەوە. هیچ لەکاتی بەفیڕۆچوو ئەوا وزەیەکی زۆریشمان بەهەدەردا. لەڕاستیدا هەروەکو چۆن باسکرا

ئەگەر ئێمە لە هەر مادەیەکی فۆسیلی دی وزەی گەرمایی وەچنگ بخەین ئەوا تەنها ئەو بەشەوزەیەمان بەفیرۆ داوە کە لە ئەنجامی هاوکێشە کیمیایەکان بونەتە هۆی سوتاندنی مادە فۆسیلیەکە و وەچنگ خستنی وزەی گەرمایی.

وەرگێڕانی گەرما بەهۆی کارەبا لە دۆخی ئێستادا بۆ هێڵەکانی گواستنەوە و وێستگەکان دەبێتە هۆی هەڵکشانی داواکاری کارەبا ( Load ) وەداواکاری کارەبایەکی زیاتر لەو توانایەی کە بەنێو ئەواندا وەردەگێڕدرێت یاخود دەگوازرێتەوە وە ئەمە دەبێتە هۆکاری بارقورسی (Overload) واتە سوتاندنی وەرگێڕەکانی کارەبای گەڕەکەکان (Transformer) و کوژاندنەوەی کارەبا.

سەرئەنجام دەبێت حکومەتی هەرێمی کوردستان نەوتی سپی بەشێوەیەکی زۆر دابین و هەرزان بکات تا هاووڵاتیان بەهۆی سوتاندنیانەوە گەرمای پێویستیان وەچنگ بخەن. بۆ چارەسەر کردنی وەرگێڕانی کارەبا بۆ گەرما دەبێت بەهۆی یاسایەکی حکومەتی هەرێمە وە ڕێگە لە فرۆشتن و بەکارهێنانی هیتەری کارەبای بەهەموو شێوەیەك نەك لە دام و دەستگاکانی حکومەتی هەرێم بەڵکو لە نێو ماڵی هاووڵاتی کوردستانیش بگیردرێت، تا بتوانین بەشێوەیەکی زانستیانە سود لە وزەی وڵاتەکەمان وەربگرین.

## ٢. وزە، هۆکاری فشاری ڕامیاری و ئابوری

نەوتیخاو و گازی سروشتی بە هۆی پاشەکەوتبونی وزەیەکی زۆر و بەکارهێنانی لە گشت بوارەکانی پیشەسازیدا و هەزارەها بەرهەمی تایبەتی بۆتە هۆی ناوزەدکردنی ئەم کانزایانە وەکو بەنرخترین کانزا لەسەر ڕویزەوی کە ژیان و تەکنۆلۆجیای ئەمڕۆکە بەبێ ئەوان هیچ واتایەک نابەخشێ. دارمانی ئابوری گشت تەکنۆلۆجیای ئەمڕۆکە کاتێک دێتە ئاراوە کە ڕێگەی گەیاندن و دابەشکردنی نەوتی خاو و گازی بن زەوی لە دونیادا توشی قەیران بێت یاخود چاڵەکانی بەرهەمهێنانیان خاڵی ببنەوە Peak Oil and Peak Gas . چونکە بنەماو چەرخێنەری توانای پیشەسازی ئەمڕۆکە تەنها نەوتی خاو و گازی سروشتییە و پایەی نەگۆڕی گشت پیشەسازی و توانای گواستنەوە لە سەرتاسەری دونیا دا بەم کانزایانە و بەشەکانیانەوە(Refinery Products) بەندە. وە بەبێ پاڵاوگەش نەوتی خاو یاخود گازی سروشتی لە دونیای پیشەسازیدا هیچ بایەخێکی نامێنێت.

هیچ کۆمەڵگایەکی ئابوری یاخود زلهێزێکی سەربازی بە بێ کۆنترۆڵ کردنی گێڵگەکانی نەوتی خاو یاخود وزەی مادە فۆسیلیەکان ناتوانێت پەرە بە زلهێزی خۆی بدات. وەهەر کۆمەڵگایەکی خاوەن ئەم کانزایانە ئەگەر کاتێک بنەمای

ئابوری خۆی لەسەر هەڵوەشانی نەوتی خاو، گازی سروشتی و پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیایی پۆلیمەرەکان (لاستیک، پلاستیک، ڕەنگ، ڕۆن، قوماش، دەرمان....) دامەزراند ئەوا بێشک دیاردەی بێکاری و پتەوی چوارچێوەی ئابوری خۆی سەقامگیر کردوە.

بەڕاشکاوی بەگشتی هۆکاری زۆربەی قەیرانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش هەر دەگەڕێنەوە بۆ هەبونی ئەو جۆرە وزە سەرەتاییانە لەم دەڤەرەدا و بەتایبەتی گشت نەهامەتیەکانی داگیرکاری نەتەوەی کوردیشمان هەر لەبەر بونی زیادەی ئەم کانزایەو گشت کانزاکانی دی یە لە وڵاتەکەماندا.

لەم بابەتەدا هەوڵی شیکردنەوەی کاریگەری هۆکارە ڕامیاریەکانی مادە فۆسیلیەکان (نەوتی خاو، گازی بن زەوی) لە دونیاو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و هۆکاری بەچەککردنی وزەش شیدەکرێتەوە.

نەوتی خاو لەگەڵ گازی سروشتی دینەمۆی وەرچەرخێنەری تەکنۆلۆجیا و ئابوریە لەسەر ڕوی زەوی. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پێویستی وڵاتە پیشەسازیەکان بە سامانی سروشتی نەوت و گاز بەرەو سەرێ هەڵدەکشێ، نەوتی خاو لەگەڵ گازی بنزەوی گرنگترین وزەی سەرەتایی ئەمڕۆکەی ئێمەن، چونکە زێدەتر لە ٨٠% گشت وزەی سودمەندی ئەمڕۆکەی ئێمە بەهۆیانەوە وەردەگێڕدرێت.

ئەوە نزیکەی سەد ساڵێکە کە لە وزەی نەوتی خاو سود وەردەگیردرێت، سەرەتا گازی بنزەوی بە بەرهەمێکی بێکەڵک پێناسەدەکرا، بەڵام پاش گوێزانەوەی بە هۆی بۆری تایبەتیەوە (Pipeline) و وەرگێڕانی بۆ دۆخی شلی و کارئاسانی لە پاشەکەوتکردنی بە قەبارەیەکی کەم ئەویش سودمەند بوو.

ئەم دوو مادەفۆسیلیە لە گشت بوارەکانی، گوێزانەوە، بەدەستهێنانی گەرما (Heat Energy) ، وەرگێڕانی وزەی کارەبا (Electric Generation) و بواری ئامادەکاری تەکنیکی ( Process Energineering ) و پیترۆشیمی سودیان لێوەردەگیرێت.

ئەم وزانە گشتیان لە ئەنجامی خەزنکردنی وزەی تیشکی خۆرەوە لە ماوەی ملیۆنەهاساڵی تەمەنی زەویدا هاتونەتە ئاراوە، بەڵام بە خێرایەکی بێئەندازە ئەوبڕەی کە لە ساڵێکدا دەسوتێنرێت، بۆ هەمان بڕی سوتێنراو ملیونەها ساڵ پێویستە تا لە ناخی زەویدا دروست ببنەوە کەواتە ها ڕۆژێک هات کە کۆتایان دێت. هەربۆیەش ئەم جۆرەوزە سەرەتاییانە مۆرکی هەتاهەتاییان پێوەنیە.

لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٠٠ م بە دواوە نەوتیخاو وەکی وزەیەکی سەرەتایی سەربەکانزا فۆسیلیەکان لە بەر هۆی چڕی وزەکەی و کەمی پۆخەڵی ژینگەش (Invironment Impact) لە ئەنجامی کرداری کیمیاویی سوتاندنی لە

بەراورد لەگەڵ خەڵوزی بەردیین و هەڵوەشاندنی بۆ وزەی پلە دوو (بەنزین Petrol) تا نێو هێزی مەكینەكان ژیانی مرۆڤی توشی شۆڕشێكی نویٚ كرد، كە ژیانی مرۆڤەكان لە گشت بارێكەوە توانی بەهۆیەوە پێشكەوتنێكی بیٚ ئەندازەی چاوەڕوان نەكراو بەخۆیەوە ببینێت.

نەوتی خاو شلەیەكی لینجاوی قاوەیی تا تاریك ڕەنگە و لە سەرچاوە فۆسیلیەكانەوە هاتووە. پێكهاتەی كیمیاوی ئەم وزەیە لە هایدرۆجین و كاربۆنە. لە بنەڕەتدا نەوتی خاو پێكهاتوە لە ٨٠ تا ٨٥ % پەیوەندی كاربۆن و هایدرۆجین (C-H)، ١٠ تا ١٢ % (H2) لە هایدرۆجین وە ٦-١ % لە گۆگرد (S) و نایترۆجین. ئەم وزە سەرەتاییە دەتوانریٚ بۆ كارەبا، گەرمی وە بەهۆی پاڵاوگەكانەوە بۆ جۆرەكانی سوتەمەنی (بەنزین، كیرۆزین) بۆ گواستنەوە،لاستیك، پلاستیك (PVC) یان وەگەڕخستنی مەكینەكان، ڕەنگ، جلوبەرگ یان گشت پێویستیەكی ڕوژانە (پۆلیمەرەكان) وەربگێڕدریٚ.

لە بازاڕەكانی جیهاندا نەوتی خاو لە بەر هۆی جیاوازی لە چۆنایەتێدا (Quality) بە كۆمەڵە نرخێكی جیاواز دەفرۆشرێت. بنەمای چۆنایەتی نەوتی خاو لە چڕی ( Density API) و ڕێژەی گۆگرد لە نێویدا سەرچاوەی گرتووە و ناوەكانی شیرین و تاڵ و سوك و قورس، ئەوناوانەن كە هەردەم لەگەڵ نەوتی خاو و نرخەكەیدا دێن. گرانی نەوتە سوكەكان كە بڕی گۆگردیان كەمە لەوەوە هاتووە كە دەتوانرێن بەشێوەیەكی خێرا بۆ بەنزین وەربگێڕدرێن.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی نەوتی خاو بە پێی شوێنگەی جوگرافی بەسەر کۆمەڵە جورێکدا پۆلێن دەکرێت، بڕی گشتی ئەو جوارانەی نەوت دەگاتە نزیکەی ٤٠ جۆر. لە بازارەکانی جیهاندا کۆمەڵێکیان وەکو معیار بۆ ئەوانەی تر سودیان لێوەردەگیرێت.

نەوتی برێنتی (Brent, API=38.5) بەریتانی و نەوتی ڕۆژئاوای تەکساس (WTI, West Texas Intermediate API=40) بەهۆی کەمی کانزای گۆگرد لەناویاندا یەکێکن لە هەرە نەوتە سوکە شیرینەکانی جیهان. واتە لە ئەم جۆرە نەوتە خاوانە دەتوانرێت بڕێکی زۆری بەنزینی لێوە بپاڵێورێت. ئەم جۆرە نەوتانە لە بازاڕدا بە نەوتی سوک ناوزەد دەکرێن و گشت جۆرەکانی تری نەوت بەهۆی ئەم دوجۆرەوە نرخبەندی دەکرێن.

نەوتی مامناوەندنی بەو نەوتانە دەوترێن کە بڕی چڕیەکەیان (API) لە نێوان ٢٠ تا ٣٥ دابێت. نەوتی وڵاتانی ئۆپێک (ئێراقیش) لەم ڕێژەیەدان، وەکو، نەوتی وڵاتی سعودی (Arab Light, API= 34)، نەوتی وڵاتی ڤێنزوئێلا کە بەنەوتی (Tia Juana Light, API=31) وە هەروەها نەوتی وڵاتی نێجیریا کە بە (Bonny Light, API=37) ناسراوە.

نەوتە سەنگینەکان بەو نەوتانە دەوترێن کە ڕێژەی چڕیەکەیان (API) لە نێوان ١٠ تا ٢٠ بێت. نەوتی کالیفۆرنیا لە ئەمەریکا بەهۆی کەمی چڕیەکەی ( API=

13.4) یاخود (California San Joaquim Valley Heavy) یەکێکە لەو جۆرە نەوتانە [٢٤].

لەپڕ بایەخی ئەم وزەسەرەتاییە زۆرشت نوسراوەتەوە و بیستراویشە، بۆیە لێرەدا تەنها لە چەندایەتی و چۆنایەتی نەوتی خاو لە وڵاتی خۆمان و دونیا دەکۆڵینەوە. بەڵام لە هێڵکاری خوارەودا روندەکرێتەوە کە چۆن نەوتی خاو بنەمای وزە و کۆمەڵێک کەرەسەی ڕۆژانەی مرۆڤەکانە.

ئەوکۆمەڵە وێنەیە ئەوەمان بۆ ڕوندەکەنەوە کە لە سەرەتای ساڵەکانی ١٨٧٠ دا، ئەم وزەیە زۆرتر بۆ چەورکردن و ڕوناکی نێو چراکان سودی لیوەردەگیرا. پاشان لە داوای ١٩٠٨ پاش دۆزینەوەی سەیارە و پەرەسەندنی بەشیوەیەکی خێرا. ئیتر لە جێگەی خەڵوزی بەردین نەوتی خاوی لە کەشتی نێو ئاو بۆ گواستنەوە بەکاردەهێنرا. پاشان تایبەتمەندی نەوتی خاو بەهۆی گواستنەوەی بەهۆی بۆری و کەشتی تایبەتی و ئاسانی لە پاشەکەوتکردنیدا، جێگەی خەڵوزی بەردنی لە دونیای وزەدا لێژکردو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بوە گرنگترین کەرەسەی پێویستی پیشەسازی و وەرگێرانی وزە لە سەرتاسەری جیهاندا. ئەمڕۆ دونیای پیشەسازی بەبێ ئەم وزیەوە و بەرهەمەکانی هیچ مانایەک نابەخشێ.




وێنەی ٢.١: کاریگەری نەوتی خاو لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەکاندا

ئەگەر لە دایەگرامی خوارەوە دا ٢.٢ کە نەخشەی جیهان نیشان دەدات، بەوردی سەرنج بدەین، بەدیار دەکەوێ کە زۆربەی کانگاکانی خەڵوزی بەردین دەکەونە بەشی سەرەوەی نیوەی گۆی زەویمانەوە (واتە گشت وڵاتە خاچ

پەرستەکان)، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تاکە ناوچەیەکە کە لەم دیاریە یەزدانیە بێ بەشە. هەر لە هەمان دایەگرامدا ئەو ڕاستیەمان دوبارە بۆ ڕون دەبێتەوە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا (زۆربەی وڵاتە موسوڵمانەکان) لە بری خەڵوزی بەردین بەبڕێکی زۆر لە سامانی نەوتی خاو بەهرەمەندن. ئەم وڵاتانە بە شادەماری (life-line) ئابوری ئەمڕۆی جیهان ناوەزەد دەکرێن.

لە هەمانکاتدا ئاشکرایە گازی سروشتی لە بەراورد لەگەڵ نەوت و خەڵوزی بەردین بەشێوەیەکی عادیلانە تر بەسەر گشت ناوچەکانی دونیا دا دابەش بووە و تەنها لە یەك ناوچەی دیاریکراودا چڕنەبۆتەوە.




وێنەی ٢.٢: کانگاکانی نەوت و گاز و خەڵوزی بەردین لە سەراسەری جیهاندا

هەر لە هەمان دایەگرامی ٢.٢ دا ئەو ڕاستیەمان دوبارە بۆ ڕون بۆتەوە کە لە وڵاتی ئێمەدا لە جیاتی خەڵوزی بەردین بەبڕێکی زۆر لە سامانی نەوتی خاو بەهرەمەندین وە دەتوانین بەهۆیەوە ژێرخانێکی ئابوری پتەو دابڕێژین کە گشت تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان لە بەڵای بێکاری وەدور بنرێن. چونکە لە بازاڕی ئازادی ئەمڕۆ دا هەر سەرمایەدارێکی دەرەکی بەبێ باك، سەرمایەی خۆی ڕەوانەی وڵاتێکی ئارام دەکا، کە بتوانێت دوا ڕۆژ قەرزەکانی پێبدرێتەوە یان لە جێگەی سەرمایەکەی زەخیرەیەکی بەبەهای وەکو نەوت یان گازی سروشتی وەچنگ بکەوێت کە لە گشت کەلەبەرێکی ئەم کونەدا بیکاتەوە بەسەرمایەکی جوڵاو.

کەواتە ئەم دیاریە یەزدانیە دەبێتە هۆی جوڵەیەکی بازرگانی و لە ئەنجامیدا، ئارامش و خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵگا، نەك تا ئەمڕۆکە دیاری شوم و نەگبەتی بهێنێت.

وڵاتی ئێراقی فیدرال وەکو یەکێک لە گرنگترین و ستراتیجیترین وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بونیادنەرو، کاریگەرترین ئەندامی ئۆپێکOil Exporting Countries OPEC و خاوەنی نزیکەی ١٢% گشت زەخیرەی مەزەندەکراوی نەوتی جیهانە [١].

بڕی زەخیرەی نەوەتی خاوی ئێراق تا ساڵی ٢٠٠٤ بە ١٧ ملیارد تەن مەزندەدەکرێت، واتە سێهەم وڵاتی دونیا (لە

پلەی یەکەمدا وڵاتی عەرەبستانی سعودی‌یە بە بڕی 35 ملیارد تەن، پاشان کەنەدا بە ٢٤ ملیارد تەن (کە زۆربەی بە نەوتی نێو زیخ دەناسرێت). بەڵام هەڵهێنجانی بەرهەمە هایدرۆکاربۆنیەکان لە نەوتی نێو زیخی کەنەدی لە بەرهەرزانی نەوتی نێو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا ئەمڕۆش کاریکی ئابوری نییە. لە وێنەی خوارەوەدا نەوتی نێو زیخی کەنەدی دەستنیشان کراوە.




وێنەی ٢.٣: نەوتی نێو زیخی کەنەدی (Oil Sands)

هەر ئەم بابەتە بەڵگە نەویستە ئابوریی‌یە کە ناوچەی ناوزەدکراو بە وڵاتی ئێراق بە هەرێمی کوردستانەوە بەهۆی هەرزانی و زۆری سامانە سروشتیەکانی هەردەم لەلایەن زلهێزەکانی جیهانەوە بە چاوی ئارەزوە وە تەماشای کراوە.

بە تێڕوانینێکی ساکار کە ئەگەر نیوەی ئەم بڕە زخیرەیە بکەوێتە نێو چوارچێوەی جوگرافی هەرێمی کوردستانەوە

ئەوا ئێمەش خاوەنی بڕێکی مەزنی زەخیرەی نەوتی خاوین. لە لایەکی دیەوە تایبەتمەندی نەوتی کوردستان لەوەدایە کە دەرهێنانی زۆر ئاسان و هەرزان دەکەوێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نەوتی کوردستان لە قوڵایەکی زۆرکەم دا زەخیرەیە و لەهەمان کاتیشدا لە ژێر پاڵەپەستۆیەکی گەورە دایە. لە وێنەی ٢.٤ دا زۆربەی چاڵە نەوتە دۆزراوەکانی هەرێمی کوردستان بە ڕونی بە ڕەنگی سەوز نیشاندراوە [٤].




وێنەی ٢.٤: چاڵە نەوت و گازەکانی کوردستان لە ناوچەی بابەگوڕگوڕ، چەمچەماڵ و سنوری ئێران و سوریە (داناگاز)

کەواتە بێشک بڕی چاڵە نەوتیەکانی وڵاتی ئێراق بە سودوەرگرتن لە تەکنۆلۆجیای پێشکەوتو لە کاری پشکنین و ڕوپێووکردنی مۆدێرنی ئەمڕۆدا هەردەم لەو نەخشە دیاریکراوەی سەرەوە زێدەترە، هەربۆیەش ئەو دەڤەرانەی کە لەوانەیە خاوەنی چاڵی نەوت و گازی سروشتین بە ڕەنگی زەرد دیاریکراوە. جگە لەوەی کە ئێراق خاوەنی ئەو بڕە خەیاڵیەی نەوتی خاوە (کە بە ۲۰۰ ملیارد بەرمیل مەزندەدەکرێت) لە هەمان کاتیشدا بە هۆی گێژاوی ڕامیاری و کودەتا یەک لە دوای یەکەکانی نێو وڵات و شەڕی چەند ساڵەی ئەم وڵاتە لەتەک ئێمەی کورد و لەگەڵ دراوسێکانی نەتوانراوە بە وردی و زانایانە گشت زەخیرەی نەوتی و گازیبن زەوی ئەم وڵاتە بەگشتی لە نێو خاکی کوردەواری خۆمان کوردستان بە تایبەتی مەزەندە بکرێت. کەواتە لە ڕاستیدا بڕی زەخیرەی ئەم وڵاتە زۆر لەوە زۆرترە کە لەگشت لێکۆڵینەوە ڕامیاریە ئابوریەکانی وزەی جیهاندا گفتوگۆی لەسەر دەکرێت. تا ئێستاکە گشت زەخیرەی نەوتی ئێراق بەگشتی بە دەیان هەزارەها ملیاد دۆلار مەزەندە دەکرێت [۳].

بەڵام ئەگەر ئێمە بەوردی سەرنجی ئەو نەخشەیەی ۲.٤ سەرەوە بدەین ئەڕاستیەمان بۆ ڕون دەبێتەوە کە بەشێکی زۆری کێڵگەکانی نەوتی خاوی ئێراق کەوتۆتە هەرێمەکەی خۆمانەوە. لە هەمان کاتیشدا ٨٠% گشت گازی سروشتی وڵاتی ئێراق دەکەوێتە هەرێمی کوردستانەوە. دۆزینەوەی

یەک لە دوای یەکەکانی کۆمپانیا بیانیەکان لە هەرێمی کوردستاندا گەواهی ئەم ڕاستیە دەدەن.

بەپێی ئامارە ئەوروپای یەکان نیوەی چاڵەنەوتەکانی نەوتی خاوی ئامادە بۆ بەرهەم هێنان لە وڵاتی ئێراقدا دەکەوێتە چوارچێوەی جوگڕافیایی هەرێمی کوردستانەوە. لەڕاستیدا بڕی نەوتی خاو لە بڕهاتووە، بەڵام دیاری کردنی ساڵی کۆتای کارێکی ئاسان نیە. گشت ئامارەکانی ئەوروپا گەواهی ئەوە دەدەن کە ڕێژەی توانای مامناوەندی خۆڕاگری نەوتی خاو لە دونیا دا تا ٤٣ ساڵی ترە [١].

بۆنمونە تەنها تا ١٠ ساڵی دی وڵاتە ئەوروپاییەکان خاوەنی نەوتن، ئەمریکای باکور تا ٩ ساڵی دی، بەڵام ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێوەیەکی مامناوەندی تا ٨٨ ساڵی تر لە نێوانیشیاندا لە وڵاتی ئێمە دەتوانرێ زۆرتر لە ١٣٢ ساڵی تر لە چاڵەنەوتەکاندا نەوت بەرهەمبهێنرێت[١]. لە دایەگرامی ٢.٥ دا ڕێژەی نەوتیخاو لە دونیا دا دێتە پێشچاومان، هەروەکو دەبینرێت زۆرن ئەو وڵاتانەی کە لەم دیاریە یەزدانیە بێبەشن.




دایەگرامی ۲.٥: ڕێژەی دابەشبونی جوگرافی نەوتیخاو لە دونیا دا

لە بەشی ڕوژهەڵاتی ناوەڕاستدا 12 % دەكەوێتە وڵاتی ئێراقەوە و بە هۆی ئەو بەڵگانەی كە لە سەرەوە باسكران نزیكەی ٥ % گشت نەوتی ئامادە بۆ بەرهەمهێنان لە سەراسەری دونیا دا دەكەوێتە هەرێمەكەی ئێمەوە (بە ناوچەی كەركوكەوە). سەرەڕای ئەم بەشە زۆرە، نەوتی وڵاتی ئێمە بەپێی ئامازەی كومەڵێك شارەزای نەوت یەكێكە لە هەرە نەوتە سوكە باشەكانی دونیا. لەبارەی نایابی و دەگمەنی نەوتی كوردستان زۆرشت نوسراوە كە نەوتی كەركوك زۆر سوكە، هەروەها مادەی گۆگردی (S) زۆركەمە كەواتە دەتوانرێ زۆر بەئاسانی و خێرا بۆ مادەی سوتەمەنی (بەنزین، كیرۆزین) وەربگێڕدرێت چونكە پێویستی بە هەوڵی بەردەوامی ئامادەسازی كراكن (Cracking) كەمە. كۆمەڵێك شارەزای كۆمپانیا بیانیەكان لە نێوان خۆیاندا وەكو نوكتە

دەگێڕنەوە کە ئەگەر بە نینۆکی پەنجە ناوچەی بابەگوڕگوڕ بڕوشێنی ئەوا یەکسەر نەوت هەڵدەقوڵێ، چونکە نەوتەکە لە چاڵەکە دا لە قوڵیەکی کەم و لە ژێر پاڵەپەستۆیەکی زۆر گەورە دایە[٢].

سەرەڕای ئەوەش کە زۆربەی بیرە نەوتەکان دەکەونە وڵاتانی جیهانی سێهەمەوە، خەرجی دەرهێنانی نەوت لەم وڵاتانەدا زۆر کەمترە لە چاو وڵاتانی دی بۆنمونە:

- لە وڵاتی عەرەبستانی سعودیدا و کەنداوی فارسدا ٢ تا ٠.٥ $ بۆ هەر بەرمیلێکە،
- لە دەریای باکوری ئەوروپا لە نێوان ٨- ١٠ $ بۆ هەر بەرمیلێك نەوت.

دیارە نەوت بە خاوی بێکەڵک و بێسودە بۆیە دەبێت بە زۆر قۆناغی پاڵاوتنی سەرەتای بڕوات. لە وێنەی خوارەودا بە شێوەیەکی ساکار گشت ئامادەکاریەکانی نەوتی خاو لە بیرەکەیەوە تا بواری گواستنەوە بۆ نێو وێستگەکانی پاڵاوتن ڕونکراوەتەوە.

لە زۆربەی بیرەنەوتەکانیشدا، لە سەرو تویژی نەوتەکەوە، گازی سروشتی بونی هەیە و دەتوانرێت پاش کاردای پاکژکردنەوە بۆ وەرگێڕانی وزەی کارەبا بۆ نێو وێستگەکە بەسود بێت (associated gas). لە بەشەکانی دهاتودا بە چڕوپڕی باسی کرداری پاڵاوتن دەکرێت.




وێنەی ٢.٦: گشت قۆناغەکانی بەرهەمهێنانی نەوتی خاو

لە بنەڕەتدا هەروەکو لە هێڵکاری ٢.٦ دادیارە، نەوتی خاو و گازی سروشتی لە کاتی هەڵهێنجانی لە بیرەکانی نێو خاکدا سەقامگیر نییە.

چونکە نەوتی خاو و گازی سروشتی بەهۆی خیرایی بێئەندازە و فشارێکی زۆرمەزن و تێکەڵاوی پیوەندییە هایدرۆکاربۆنیەکانی دۆخی شلی و دۆخی گازی، گازە ژەهراوییەکان، بونی ئاو لە دۆخی شلی و هەڵمیداو دەبێتە هۆی ئەوەی کە لەسەرتادا وەرگێڕان و ئامادەکردن و گواستنەوەی زۆر دشوار بێت. لە نێو ئامێرەکانی ئامادەکردنی تەکنیکیدا (Processing) پێویستە نەوتی خاو گازی سروشتی ئامادەبکرێت بۆ گواستنەوە و قۆناغی

وەرگێڕان.

بە شێوەیەکی گشتی گازی سروشتی بە کۆمەڵە شێوەیەک وەکو گازی وشک (Dry gas) گازی تەڕ (Wet gas)، گازی شل (Condensate gas) وە گازی نێو بیرەنەوتیەکان ( Associated gas) هەبونی هەیە.

گازی سروشتیش بە هۆی سودلێوەرگرتنی لە گشت بوارەکانی وەرگێڕانی وزەو ئامادەکاری تەکنیکی و پیترۆکیمیاویی لە جیهانی پیشەسازی ئەمڕۆکە دا وەکو نەوتی خاو گرنگە، چونکە لە دوای کرداری سوتاندن زیانەکانی بۆ سەر ژینگە لە نەوتی خاو گەلێک کەمترە. هەر بۆیەش لە ئایندەیەکی نزیکدا گازی سروشتی پێگەی خۆی لە گشت بوارێکدا لە سەر ڕوی زەوی قایم دەکات. بۆ نمونە ئەمڕۆکە لە سەرتاسەری دونیا دا هەوڵ بۆئەوە دەدرێت کە هەرچی زۆرتر کارەبا لەو وێستگانەوە وەربگێڕدرێن کە بەهۆی سوتاندنی گازی بن زەویەوە لەگەڵ هەڵمی ئاو کارەدەکەن (Combined Cycle ).

لە ٢ % کانگاکانی گازی بن ئەرز لەسەراسەری دونیا دەکەوێتە وڵاتی ئێراقەوە، کە ئەویش نزیکەی Tm3 ٤ ترلیون مەتر سێجا دەکات، کە واتە نیشتیمانی ئێمەش لە چاڵەکانی گازی بن ئەرزی ئامادە بۆ بەرهەم بێبەش نیە، ئەو بڕە دەکاتە ١,٥ % ی گشت چاڵەکانی دونیا، کە ئەمەش ڕێژەیەکی خەیاڵییە.

بـەهۆی دایـەگرامی ٢.٢ وە بۆمـان ڕون دەبـوەوە کـە گـازی بـن ئـەرز لــە بــەراورد لەگــەڵ نــەوت و خــەڵوزی بــەردین بەشێوەیەکی عادیلانە تر بەسەر گشت ناوچەکانی دونیـا دا دابـــەش بـــووە تـــەنها لـــە یـــەك ناوچـــەی دیـــاریکراودا چڕنەبۆتـــەوە. لەدایـــەگرامی ٢.٨ ڕێـــژەی گشـــت کانگاکـــانی ئامـادە بـۆ بەرهـەمی گـازی بـن ئەرزلـە سەراسـەری دونیـادا نیشان دراوە.

هـەروەکو چۆن لـە دایەگرامـی ٢.٧ دا نیشـاندراوە گـازی بـن زەوی بـەزۆری لـەجۆری گـازی مێتانـە (CH4) وە و بـەشـێکی لـە ئێتـــان ( C2H4) و پرۆپـان (C3H4) ، نـایترۆجین (N2) و هـەروەها دی ئۆکسـیدی کـەربۆن ( $CO_2$) پێکهـاتوە. لـە وێنـەی خوارەودا ئـەم بابـەتە دوبارەڕونکراوەتـەوە.




وێنـەی ٢.٧: پێکهاتـەی گـازی سروشتـی لـە نێو بیرەکاندا

**خاڵە باشەکانی گازی بنزەوی:**

١. بەشێوەیەکی گونجاو دەتوانرێ لە وێستگەی وزەوەرگێڕی گازوهەڵم وەکو سوتەمەنی بەکاربهێنرێت،

٢. بنچینەی گازی سەرەتاییە بۆ گشت کارگەکیمیاوییەکان.

٣. باشترین جۆری وزەیە بۆ سوتەمەنی و گەرمکردنی نێومالْ.

٤. باشترین وزەی فۆسیلی سەرەتاییە کە ژینگە لە ئەنجامی سوتاندنیدا زۆر بە دی ئۆکسیدی کاربۆن ($CO_2$) و گازە ژەهراویەکانی دی پیس نابێت.




دایەگرامی ٢.٨: ڕێژەی گشت چاڵەکانی گازی بن زەوی لە سەراسەری دونیا دا



وێنەی ٢.٩: گواستنەوەی مادە هایدرۆکاربۆنیەکان بەهۆی بۆری گواستنەوە

گازی نێو چاڵەکانی بن زەوی دەتوانرێت بە دوو ڕێگەی ناسراو بگەیەنرێتە دەستی هاوڵاتی بەکارهێنەر:

- گازی سروشتی بەشێوەی لولەی بۆری ( Pipeline)،
- بەشێوەی شلەمەنی ( liquefied natural gas -LNG).




نەخشەی ٢.١٠: گوێزانەوەی گازی سروشتی بەهۆی بوری هەروەها لە دۆخی شلیدا

پاش کرداری شیرینکردنی گاز بەشێوەی گازی بەشێکی زۆری گازی سروشتی لە دۆخی گازی دا پێکدێنن کە پڕۆپان (Propan) و بۆتان (Butan) لەگەڵ دایە کە ئەگەر بەشی گازی شلی (LPG) لێکجیانەکرابێتەوە. لە کرداری شیرینکردنی گازی سروشتیدا هەوڵدەدرێت کە پەیوەندی نێوان گۆگرد و هایدرۆجیندا (H2S) لە گازی سروشتی جیابکرێتەوە چونکە ئەم پەیوەندیە جگە لە ژەهراوی و مەترسی بۆ سەر گیانی مرۆڤەکان دەبێتە هۆی خولقاندنی ترشێ سۆلفیدی هایدرۆجین (H2SO4) و ژەنگهەلگێڕانی گشت ئامێرەکان.

بەڵام پێکهاتەیەکی تری گازی سروشتی لە دۆخی شلی

(liqufied Petroleum Gas (LPG) دا لـە پێکهاتـەی پرۆپـان و بۆتـان پێکـدێت. ئـەم پێکهاتەیـەی گـازی سروشـتی لـە بارودۆخی مامناوەندی دا (P=1 bar, T= 25 grad C) لە دۆخی گازدایـە، بـەڵام لـە ئـەنجامی بەرزکردنـەوەی پەستاندا تـا نزیکـەی Bar ۸ بـاڕ دەتوانرێت بگەیەنرێتـە دۆخـی شلـی و سودلێوەرگرتن و گواستنەوەی ئاسانترە.

لـە سـەرەتاکانی بەرهـەمهێنانی نـەوت و گـازی سروشـتی دەبوایە کە گشت کۆمپانیاکان گازی سروشتی بەرهـەمهێنراو لەگـەڵ نـەوت دا جیابکەنـەوە و بسوتێنن (send it to Flar)، چونکە ئەوزەمانە بـە هـۆی لاوازی بـواری پیشەسازی توانـای گواستنـەوەی گاز بەهۆی بۆری یاخود لـە شێوەی دۆخـی شلـی لەئارادا نەبو. هەرچەنـدە ئـەم سوتاندنـی گـازە تـا ئـەمڕۆش بـەهۆی دواکـەوتویی پیشەسـازی گـازی سروشـتییەوە لـە زۆربەی وڵاتـە خـاوەن گـاز و نـەوتەکانـدا پراکتیـزە دەکرێت و دەبێتـە هـۆی بـەفیڕۆچونی سەرمایەوە پیسی ژینگـە. لـە وێنـەی خـوارەوەدا ئـەو بابەتـە ڕونکراوەتـەوە.



وێنەی ٢.١١: سوتاندنی گازی سروشتی بە هۆی مەشغەڵێکەوە، واتە Gas Flaring

تائەمڕۆش لە وڵاتی ئێراقدا ساڵانە بەبڕی چەند ملیارد دۆلارێک گازی سروشتی بەهۆی دواکەوتوی پیشەسازی سودلێوەرگرتنیەوە بە بێهۆ دەسوتێت، کە ئەویش جگە لە زیانی ئابوری کاردانەوەی خراپی لە سەر ژینگەی وڵات هەیە. لە وێنەی خوارەودا کرداری سوتاندنی گازی سروشتی لە کێڵگەکانی دەڤەری کەرکوک خراوەتە ڕوو.



وێنەی ٢.١٢: سوتاندنی گازی سروشتی لە دەڤەری کەرکوک، واتە Gas Flaring

بەڵام ئێستاکە بەم دوو شێوەیە گازی سروشتی (لە دۆخی گازی و شلی) دەگاتە گشت کونجێکی وڵاتە پیشەسازیەکانی ئەوروپاو ئەمریکا و ئاسیا. شەبەکەیەکی مۆدێرنی بۆری گازی سروشتی لە جیهاندا وەهای کردوە کە گاز بگاتە گشت کونج و قوشبنێکی هەر وڵاتێکی پێشکەوتوو. لە نێوان هەر

١٠٠ تا ٢٠٠ کیلۆمەترێکدا بنکەیەکی پاڵنەری کۆمپرێسەر هەیە کە پاڵ بەگازەکەوە دەنێت و دوبارە پلەی گەرما و پاڵەپەستۆی گازەکە بۆ گوێزانەوەی دیاریکراو دابیندەکرێت.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گازی سروشتی بەهۆی پاکی بۆ ژینگە لە ولاتانی پیشەسازی ئەوروپا گرنگتر دەبێت و هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە هەردەم بۆری گازی سروشتی بۆ گشت گوندێک و شارێکی ئەورپا بەڕێوەیە.

بەپێی تازەترین ئاماری ئەوروپایەکان چاڵەکانی گازی بنزەوی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا تا نزیکەی ٢٠٠ ساڵی تر دەتوانرێ لێیانەوە گازی بنزەوی بەرهەم بهێنرێن، بەلام لە ولاتە ئەوروپایەکاندا تا ٢٢ ساڵی تر [١]. لە دایەگرامی ٢.٨ دا گرنگی ولاتی ڕوسیامان بۆ ڕونبوەوە، کە نزیکەی ٣٠% گشت گازی ڕۆژانەی ئەوروپا دابین دەکات.

بازاڕی گاز لە ئەوروپادا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بەهۆی بەکارهێنانی گاز لەبواری وەرگێڕانی کارەبا و کەمی پیسبونی ژینگە لە ئەنجامی سوتاندنی، لە پەرەسەندن دایە. کەواتە کێبەرکێیەکی گەرم کەوتۆتە نێوان کەزاکستان و تورکەمەنستان و ئێران دژی ڕوسیا کە هەریەك لەم ولاتانە هەوڵ دەدەن بازاڕی پیشەسازی ئەوروپا بۆ خۆیان بقۆزنەوە بە بۆری گازی سروشتی بگەیننە ئەورپا. لە نێوان ئەم کێبەرکێیەدا ولاتی تورکیا بەهۆی ستراتیجیەتی، کە تاکە ڕێگەی نزیکی خاکی گەیشتن بە ئەوروپایە لە

پەرەسەندن دایە. پڕۆژەی گازی نابۆکۆ بەرچاوترین پڕۆژەی گازی سروشتی لەم بوارەدا.

ئاخۆ گەلۆ ئەم وڵاتەی تورکیا چەند مەرامی ڕامیاریی خۆی (کە زۆربەیان دژی ئێمەن، تا ئەو کاتەی هۆکاری نزیکبونەوەی لە ئەوروپای یەکگرتو هێڵی ڕامیاری کلاسیکی ئەم وڵاتە دەگۆڕێ) دوبارە بەسەر گشت وڵاتەکانی ناوچەکەو جیهاندا بسەپێنێ. کەدەبێت دوبارە ئەم بابەتە لەلایەن کاربەدەستانی سیاسی وڵاتەوە بەوردی شرۆڤە بکرێت.

بەڵام ئەم نایەکسانیە لە دابەشبونی گشت کێڵگە و چاڵەکانی کانزافۆسیلیەکان لە سەر ڕوی زەوی بۆتە هۆی خولقاندنی کۆمەڵە گێژاوێکی ڕامیاری ئاڵۆز کە کارتێکەرەکانی لە سەر ژیانی ئێمەش لە کوردستاندا تا ئەمڕۆ بۆ گشتمان بەڵگە نەویستن (بەتایبەتی هۆی سەرەکی داگیرکاری و پارچەکراوی کوردستان دەگەرێتەوە بۆ هەمان بابەت). لێرەدایە کە وزەش وەکی ئامێرێکی شەڕەنگێزی لەلایەن وڵاتە داگیرکەرەکانەوە بەچەک کراوە. کەواتە بەچەککردنی وزە ئەو دیارییە ناقۆڵاییەی مرۆڤایەتییە کە بە میرات گەیشتۆتە نێو وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی، وە کوردستان بەتایبەتی.

لە سەرەتای مێژووی هاوچەرخمانەوە ئاشکرایە کە سودوەرگرتن و بە چەککردنی وزەی مادەفۆسیلیەکان وەکی

کارتێکی ڕامیاری کوشندە ڕەگی قوڵی لە مێژووی وڵاتە سەرمایەدارەکاندا هەیە. جگە لە شەڕی جیهانی یەکەم، لە شەڕی جیهانی دووەم دا هۆکاری دارمانی وڵاتی ئەڵمانیا و ژاپۆن هەر دەگەڕێتەوە بۆ نەبونی ئەم جۆرە وزانە لە وڵاتەکانیاندا.

لەشەڕی جیهانی دووەم پاش ئابڵوقەی ئەمەریکا بۆ سەر ژاپۆن، کە ڕێگەی گەیشتنی نەوتی لێگرت بوە هۆی ئەوەی کە ئەویش ڕاستەخۆ بکەوێتە نێو شەڕەکەوە.

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا بە هەمان شێوە لە وزە وەکی چەکێک بۆ تێکڕامانی باری ئابوری وڵاتەکانی دی و خولْقاندنی فشاری ڕامیاری کەڵکی لێوەرگێراوە. بۆ نمونە سەرەتا پاش کودەتای قەزافی لە وڵاتی لیبیا و پاشان لە گێژاوی شەڕی نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٣ دا بۆ یەکەمین جار پاش نەفرۆشتنی نەوتی خاو لەلایەن وڵاتە عەرەبیەکانەوە بە وڵاتانی ڕۆژئاوا ئاوەها بە زەقی وزەش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بوو بە چەکێکی پاڵەپەستۆی ڕامیاری. ئەمە قەیرانی سەرەتای وزەبوو.

لەو ساڵەدا ئەم کانزافۆسیلیانە وەکی کارتێک بۆ فشاری ڕامیاری واتە بە چەککردنی وزە وەکی ئامێرێک سودی لێوەرگێرا تا ئەو ڕادەیەی کە خولْقاندنی قەیرانێکی مەزنی وزەی لە نێو وڵاتە ئەمریکاییەکان و ئەوروپایە پیشەسازیەکاندا لێکەوتەوە. ئەم قیرانی وزەیە و وە

دووبارەبونەوەی لە ساڵی ١٩٧٩ دا پاش سەرکەوتنی شۆڕشی کۆماری ئیسلامی ئێران و شەڕی نێوان ئێران و ئێراق بووە هۆی گۆڕینێکی ڕادیکاڵی بەرچاوی بیرۆکەی ڕامیاری وزە و دابینکردنی لە نێو ئەو وڵاتە پیشەسازیانەدا. ئەمەش قەیرانی دووەمی وزە بوو لە جیهاندا.

بەچەککردنی وزە و خولقاندنی گشت قەیرانەکانی نێو دونیا بۆتە هۆی هەرچی بەرەوسەرچونی نرخی ئەم وزانە لە نێو بازارەکانی دونیادا. چونکە دروستبون و جێگیربونی نرخی مادەفۆسیلیەکان پەیوەندی بە باری ڕامیاری وڵات، پلەی شڵەژاندنی ژینگە و زەخیرەی ئەو مادانە لە سەر ڕوی زەوی وڵاتاندا هەیە. کە لە بەشەکانی داهاتودا بە تێروتەسەلی شرۆڤەدەکرێت.

یەکێک لە خاڵە گرنگەکان لە بارەی سودلێوەرگرتنی ئەم وزەیە ئەوەیە کە لە برهاتوە. زۆربەی لێکۆڵەرەوانی بواری دەرهێنانی نەوت ئامازە بەوە دەکەن کە چۆن ساڵانە بڕی پێوستی نەوت بۆ دانیشتوانی سەرزەوی ٢ % زیادە دەکات. بەڵام بەهۆی باشتربونی باری ئابوری و پیشەسازی لە هەرێمی کوردستاندا بڕی پێویستی وزە لە هەرێمەکەماندا بە نزیکە ٢٠ % بەرەو سەرێ هەڵدەکشێت.

لە هەمان کاتیشدا بڕی ئەو چاڵە نەوتیانەی کە نەوتی تێدا هەڵدەهێنجرێن لە کەم بونەوەدان. کە دیاردەی ئەم کەمبونەوەیەش بەگشتی کاردەکاتە سەر هەڵکشانی نرخی

نەوت لە جیهاندا.

ئەم هۆكارانەش دیاردەی لە بڕهاتوی ئەم كانزا سەرەتاییە دەسەلمێنن. لە وێنەی ٢.١٣ دا نرخی نەوتی خاو لەگەڵ كەم بونەوەی چاڵە نوێ دۆزراوەكانی نەوتی خاو لە چەند ساڵێكدا دیاری كراوە.

كەواتە بەكورتی لە لایەكەوە هۆكارە ڕامیاریەكانی نێو وڵاتە دیكتاتۆرەكان، نایەكسانی كۆمەڵگا (بەرەو سەندنی دیاردەی تیرۆریزم) بۆنەتە هۆی گرانبونی وزەی مادە فۆسیلیەكان، كە ئەمە بەهۆی دایەگرامی ٢.١٤ دا لە سەر نرخی بەرمیلێك نەوتی خاو وەكو نمونە دووبارە ڕونكراوەتەوە.




دایەگرامی ٢.١٣: پەیوەندی نێوان نرخی نەوت و گەڕان و دۆزینەوەی چاڵی نوێ بۆ بەرهەمهێنانی




دایەگرام ٢.١٤: گۆڕانكاری لە بەهای بەرمیل نەوتیخاو
لە ماوەی چل و پێنج ساڵدا

هەر چەندە بەرەوسەر هەڵگەڕانی نرخی نەوتی خاو بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ كاردەكاتە سەر وڵاتە هەژارەكان كە خاوەنی هیچ سەرمایەیەكی سروشتی و نەتەوەیی نین و لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی هیچ تەكنۆلۆجیایەكی پێشكەوتو نین كە بەهۆیەوە پارەی كڕینی نەوت جوبران بكەنەوە بەڵام كاریگەری گرانبونی نەوت لەسەر چوارچێوەی هەندێك وڵاتە پێشكەوتوەكان ئاوەها جەرگبڕ نییە، چونكە ئەوانە لە پاش گرانبونی نرخی نەوت هەوڵدەدەن كە كەرەسەی پێشكەوتوی خۆیان بە نرخێكی زیاد بە وڵاتەكانی

خاوەن نەوت بفرۆشنەوە و دوبارە دۆلارەكانیان بگێڕنەوە نێو وڵاتەكانیان.

چونكە لە ڕاستیدا هەریەك لە حكومەتە پیشەسازییەكان بەگشتی و وڵاتە ئەوروپاییەكان بەتایبەتی بە زێدەتر لە دەیان جار لە بەرابەر وڵاتەكانی خاوەن نەوتی خاوی نێو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە قازانجی كڕین و فرۆشتنی نەوتیخاو سودمەندن. واتە ئەم وڵاتە پیشەسازیانە توانیویانە بەهۆی بیرۆكەیەكی ئابوری ڕاست لە بەرهەمی ئەو كانزایە بخۆن كە خۆیان خاوەنی نین.

بەڕاشكاوی لێرەدا بۆ گشتمان ئاشكرادەبێت كە بەرهەمی بیری مرۆڤ گەلێك بەسودترە لە بەرهەمی كانزاكانی نێو وڵات، چونكە ئەو كانزایانە هەیشەیی نین، بەڵام بەرهەمی بیری مرۆڤ هەردەم لە نەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكی دی لە نوێبونەوەدا یە.

كەواتە هەورەكو چون لە دایەگرامی خوارەوەدا ٢.١٥ نیشان دراوە بەس لە لایەن حكومەتی ئەڵمانیاوە ٧٥ % نرخی لیترەنەوتەكە بە ناوی باجەوە بەرەو سەرێ براوە و ٦ % بۆ گواستنەوە، پاڵاوتن (لەو لیترە نەوتەدا تەنها یەك لەسەر پێنجی نرخەكەی تەرخان دەكرێت بۆ كاری پاڵاوتن) و ئەنباركردن تەرخانكراوە وە تەنها ١٩ % نرخی كڕینی نەوتەكەیە.




دایەگرام ٢.١٥: هەڵسەنگاندنی نرخی لیترێک نەوتیخاو پاش فرۆشتنی وەکی بەنزین لە بازاڕەکانی ئەڵمانیادا

لە ساڵی ٢٠٠٦ دا بەهەمان شێوەش پاش سەرکەوتنی شۆڕشی نارنجی واتە باڵی ڕامیاری بەرهەڵستکاری پێشکەوتنخواز لە وڵاتی ئۆکرائینا بە سەر گروپی سەربە وڵاتی ڕوسیا و هاتنەکایەی بیرۆکەیەکی دیموکراسی سەربە وڵاتانی ئەوروپایی یەکگرتو و دوری ڕامیاری لە وڵاتی ڕوسیاوە.

هەر لەوێشدا بوو کە وڵاتی ڕوسیا بۆ فشار خستنە سەر ئەم شۆڕشەنارنجی یە سودی لە وزە وەکی چەکێکی ڕامیاری ترسناک وەرگرت و ڕێگەی لە فرۆشتنی گاز بۆ ئەو وڵاتە

گرت. کە بوە هۆی خوڵقاندنی قەیرانێکی ئابوری و ڕامیاری لەو وڵاتەدا، کە کاریگەریەکانیشی تا ئەمڕۆ هەربەردەوامە.

وزەو خاوەنداریێتی سەرچاوەکانی وزەسەرەتایەکانی نەوتی خاو و گازی سروشتیە کە وای لە ڕوسیا کردوە کە ئەم وڵاتە پاش دارمانی بلۆکی سۆشیالستی دوبارە جێی پێی خۆی لە سیاسەتی دەرەوە بکاتەوەو زلهێزی خۆی بسەپێنێت. کارتی سەرەکی سیاسەتی پۆتین و لایەنگرەکانی لەم ڕوسیایەی نوێیەدا تەنها فشاری سیاسی، ئەو گشت وزەیەیە و وابەستەیی گشت دراوسێکانی بە وزەی نەوتی خاو و گازی سروشتی وڵاتی ڕوسیاوەیە. ئەم بابەتە بەو سەرئەنجامەمان دەگەیەنێت کە لە داهاتودا فشاری سیاسی بۆ سەر گشت دونیا تەنها بە هۆی خاوەنداریێتی نەوتی خاو و گازی سروشتیە وە دەبێت.

جگە لە وڵاتە سەربەخۆکان لە لایەن تیرۆریستانیشەوە سودوەرگیراوە لە وزە وەکی چەکێک بۆ خوڵقاندنی ناسەقامگیری ئابوری نێو وڵاتە سەرمایەدارەکان و فشار بۆ سەر وڵاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست. هەوڵە خۆکوژیەکانی تیرۆریستیەکانی نێو وڵاتەکانی عەرەبستانی سعودی و ئێراق پاش تەقاندنەوەی کێڵگە نەوتیەکان و بۆریەکانی گواستنەوەی نەوت لەم ساڵانەدا بۆ گشتمان بەڵگەنەویستن. ئەو وڵاتانە لە لایەکەوە لەلایەن تیرۆریستانەوە فشاری دەخرێتەسەر کە بەڕاستی ئازاریان پێدەگات و لە

هەمانکاتیشدا دەبێتەهۆی گۆڕانکاری لە نرخی وزە لە بازاڕی وزەدا.

نوێترین بیرۆکەی بەچەککردنی وزە لە کوریای باکورە. کە ئەویش بەهۆی کۆنترۆڵکردنی وزەی ناوەکی یاخود خاوەنداریێتی تەکنۆلۆجیای ئەتۆمی و چەکی ئەتۆمی هەوڵی سەقامگیری چوارچێوەی ڕامیاری وڵاتەکەی خۆی دەدات. کەواتە ئەم وڵاتە برسییە بەهۆی ئەم چەکە کوشندەوە نەک دراوسێکانی بەڵکو گشت دونیاش دەخاتە ژێر فشاری ڕامیاریەوە. لە هەمانکاتیشدا گەورەترین شکستی ڕاستای ڕامیاری زلهێزی جیهانی ئەمەریکا نیشان دەدات کە نەیتوانی ڕێگە لە بڵاوبونەوەی تەکنۆلۆجیای تەتۆمی بەگشتی و چەکی ناوکی بەتایبەتی بگرێت. هەر بۆیەش وڵاتی ئەمریکا گشت هاوکاریەکی ئابوری ئەم وڵاتە دەکات، بۆئەوەی خۆی لە پەرەپێدانی چەکی ناوکی دور بگرێت.

سەرئەنجامەکانی گفتوگۆی نێوان کۆریای باکور و ئەمەریکا لەوە دەچێت کە گەیشتبێتە ئامانجێک، واتە ئەمەریکا دەبێت هیچ هاوکاری ئابوری ئەو وڵاتە بکات بەڵکو لە هەمانکاتیشدا دەبێت هیچ گرفتێک بۆ کاربەدەستانی ڕامیاری ئەو وڵاتەو هێشنەوەی ڕژێمە کۆمۆنیستەکەی نەدات.

لە نێو دراوسێکانمانەوە نزیکترینیان هەوڵی وڵاتی ئێرانە بۆ گەیشتن وە سودوەرگرتن لە تەکنۆلۆجیای ئەتۆمی. لەم

بـوارەدا ئێـران بـە ئـارەزوی پیتانـدن و پـالاوتنی کـانزای یۆرانیۆم و سـەرئەنجام کۆنترۆڵکردنی وزەی نـاوەکی هـەمان ڕێچکـەی کۆریـای بـاکوری گرتۆتەبـەر. دیـارە لـە گشت وتـەی کاربەدەسـتانی ڕامیـاری وڵاتـی ئێرانـدا گوایـا مـەرام و هەدەفی ئەم گەیشتن بەم تەکنۆلۆجیایەو ئەم لێکۆڵینەوەیە تـەنها بـۆ وەرگێڕانـی وزەی ناوەکیـە بـۆ وزەی پلـەدوو واتـە کارەبا واتە کەڵکوەرگرتن لە تەکنۆلۆجیای ئەتۆمی تەنها بۆ مەرامێکی سیڤیلی و زانستیەو بەس، نەک مەرامێکی ژێر بـە ژێری سەربازی بۆ وەچنگ خستنی بۆمب و چەکی ناوەکی.

لـە وێنـەی خـوارەوەدا وێستگەی وەرگێڕانـی وزەی کارەبـا بـەهۆی وزەی ناوەکیـەوە نیشـان دراوە. کـورەو ڕیـاکتۆری سوتانـدنی کانزای یۆرانیۆمەکە لە ژێر ئەو گومەزە خڕەدا یـە لە نێوەندی وێستگەکەدا.




وێنـەی ٢.١٦: وێستگەی ١٠٠٠ مێگاواتـی لـە شاری بوشـەهر لـە وڵاتـی ئێران

لەم بابەتەدا هەوڵدەدرێت ئەوە مەبەستە شیبکرێتەوە کە هیچ جیاوازیەک لە نێوان ڕیچکەی گەیشتن، کۆنترۆڵکردن و لێکۆڵینەوەی وزەی ناوەکی بۆ مەرامی سەربازی (Just for military use) یاخود سڤیلیدا (Just for Sivil use) نییە.

کانزای یۆرانیۆم، کانزایەکی خاوی سەرەکی یە کە بۆ وزەوەرگێڕانی ناوەکی سودی لێوەردەگیرێت. لە سەرەتادا مادەی یۆرانیۆم (Uranium) کە لە سروشتدا بە ڕێژەی چڕی نزیکەی ٠.٩ % دا هەبونی هەیە دەبێت بە هۆی کۆمەڵە ئامێرێکی پاڵاوتن چەند هەزار جار بپاڵێورێت، تا ڕێژەی چڕیەکەی بە ٣.٥ % دەگات و ئەم ڕێژەیەش لەبارە بۆ سودوەرگرتنی کانزاکە بۆ نێو وێستگەیەکی وزەوەرگێران بۆ وەچنگخستنی وزەی کارەبا واتە مەرامی سیڤیلی تەکنۆلۆجیای ئەتۆمی.

لە وێنەی خوارەوەدا وێنەی ئەو ئامێرە خراوەتەڕوو کە پاش وەرگێڕانی یۆرانیۆم بۆ کێکی زەرد (Yellowcake) و وەرگێرانی بۆ گازێک کە بە (Gas Hexafluorid) یاخود لە نێو ئامێرەکەدا کانزای پێکهاتەی یۆرانیۆم ( Uranium hexafluoride: UF6) بۆ یۆرانێۆمی چڕتر دەپاڵێورێت.




وێنەی ٢.١٧: ئامێری (سنتەر فیوگی) پاڵاوتنی کانزای یۆرانیۆم

ئەو ئامێرەی سەرەوە کە بە سنتەر فیوگ ی گازی دەناسرێت (Gas centrifuge). لە نیو ئەم ئامێرەدا $UF_6$ لە لولەکەدا بە خێراییەکی زۆر دەسوڕێنرێتەوەو لە پاشان یۆرانیومی $U_{235}$ سوکترە لە $U_{238}$، کە لە بەهۆی کێشەکەیەوە ئەم دوو جۆرە یۆرانیومە لە یەکدی جیادەکرێنەوە.

بەڵام بۆ پاڵاوتنی پێکهاتەی یۆرانیوم و بڕی پێویست بۆ هەرمەرامێک پێویستە هەزارەها ئامێری ئاوەها بە شێوەی زنجیرەیی لە هەمانکاتدا یەکە لەدوای یەک بە یەکەوە بخرێنە گەڕ، کە لە وێنەی خوارەوە ٢.١٨ دا ئاوەها وێستگەیەکی پاڵاوتنی پێکهاتەی یۆرانیوم خراوەتە ڕو. بۆ وەچنگخستنی بڕی پێویستی یورانیوم کۆمەڵە وێستگەیەکی ئاوەها پێویستە.



**وێنەی ٢.١٨: وێستگەی پاڵاوتنی کانزای یۆرانیوم**

بەڵام بەهۆی هەمان ئامێرەکانی پێکەوەلکێنراوی پاڵاوتنی یۆرانۆمەوە پاش بەسەربردنی ماوەیەکی کاتی زۆرتر لە بەراوەرد لەگەڵ ئارەزوی سیڤیلی سەرەوەدا دەتوانێرت ڕێژەی چڕی کانزای یۆرانیۆمەکە بۆ سەرو لە ٩٠% بگەیەنرێت کە ئەویش لەبارە بۆ چەکی ئەتۆمی. کەواتە بە هۆی هەمان وێستگەوە تەنها ژمارەی ئامێرەکان و کاتی بەسەربردنی پاڵاوتن جیاوازی دەخاتە نێوان مەرامی

سیڤیلی و سەربازی.

لە ڕێگەیەکی دیەوە پاش کرداری وزەگۆڕکێ لە بنکەی وەرگێڕانی وزەی ئەتۆمی بۆ وزەی کارەبا واتە پاش پیتاندنی کانزای یۆرانیۆم لە کرداری زنجیرەیی پیتاندن و ئازادبونی وزەی ئەتۆمی، کانزای یۆرانیۆم دەگۆڕێت بۆ کانزای پلۆتۆنیۆم کە ئەویش کەرەسەی ترسناکترین چەکی ئەتۆمییە (تکایە بڕوانە وێنەی ٢.١٩). واتە مەرامی سیفیلی وەرگێڕانی وەزی کارەبا خۆی سەرەتای دەستپێکردنی قۆناغی وەچنگخستنی کەرەسەی سەرەتایی چەکی ناوەکییە.




دایەگرامی ٢.١٩: چوار قۆناغی قلێشانەوەی ئەتۆمی یۆرانیۆم (U235)

لە هێڵکاری ٢.٢٠ دا کرداری زنجیرەیی پیتاندن و ئازادبونی وزەی ئەتۆمی لە کانزای یۆرانیۆم خراوەتەڕو.

لەم کردارەدا وزەیەکی بێشومار ئازاد دەبێت کە بە وزەی ناوەکی ناوزەد کراوە.



هێڵکاری ٢.٢٠: کرداری زنجیرەیی پیتاندن و ئازادبونی وزەی ئەتۆمی

لێرەدا بەو سەرئەنجامە دەگەین کە هیچ جیاوازیەک لە نێوان سودوەرگرتن لە تەکنۆلۆجیایی ئەتۆمی بۆ مەرامی سەربازی یاخود سیڤیلی لە ئارادا نییە. سەرەڕای ئەمانەش وڵاتێکی وەکی ئێران کە خاوەنی مەزنترین کێڵگەی نەوتی خاو و دووەم زەخیرەی گازی سروشتَی لە دونیادایەو لە بواری وزەی وزەنوێبوەکانیشدا خاوەنی پۆتێنسیالێکی مەزنی وزەی تیشکی خۆرە و لەگەڵ جوڵەوزە و وزەی پوتێنسیالی ئاووە، بەڕاشکاوی لە مەرامی پەرەپێدانی

تەكنۆلۆجیای ناوەكی جگە لە نیازی بەچەككردنی وزە هیچ مەرامێكی دی نییە.

وە هەڵبژاردنی دورگەی شاری بوشەهریش، هەروەكو چۆن لە وێنەی خوارەوەدا هاتووە، لە نزیك وڵاتە خوشگوزەرانە پێشكەوتوەكانی نێو كەنداوی فارسیش وەكو ئیماراتی یەكگرتوی عەرەبی، كوێت جگە لە فشاری ڕامیاری بۆ سەر ئەم وڵاتانە هێچ مەرامێكی سەرەكی دی تیادا نابینرێت.




نەخشەی ٢.٢١: نەخشەی وڵاتی ئێران و تایبەتمەندنی جیۆپۆلیتیكی شاری بوشەهر

چونکە بە بچوکترین کارەساتی ئەتۆمی (نمونە: چڕنۆبیل لە وڵاتی ئۆکرائینا) گشت ناوچەکە لە پاش بەربڵاوبونەوەی تیشکە کوشندەکانی وزەی ئەتۆمی ( ئاڵفا، بێتا و گاما ) دەگۆڕێت بۆ جەهەنەم واتە ژیان بە تیرەیەکی ٥٠٠ کم دژوار دەکات کە ئەویش ماڵوێرانی بۆ گشت وڵاتانی چوارچێوەی کەنداوی فارسی دەگرێتەوە.

بەڵام سەرەڕای ئەم فاکتانە ئێرانیێکان مافی خۆیانە کە بڵێن نەوتی خاو گازی سروشتی جگە لەوەی لەبڕهاتون و گرنگترین وزەو سامانی سروشتی وڵاتن کە بەهۆیانەوە زۆربەی داهاتی وڵات دابیندەکرێت، بۆیە ئەوان نایەنەوێت بۆ وەرگێڕانی کارەبا بیسوتێنن، هەربۆیەش بەدوای وزەیەکی تر دادەگەڕێن کە بەهۆیەوە وزەی کارەبای ئایندەی وڵات دابینبکەن و ئەم مافەش ناتوانرێت لە هیچ وڵاتێکی سەربەخۆ بسەنرێتەوە.

لەم ڕۆژانەدا پاش گێژاوی نوێیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست واتە شەڕی شەشەمی عەرەبەکان و ئیسرائیل فشارێکی زۆر لە لایەن میدیاکانی وڵاتە عەرەبیەکانەوە دەخرێتەسەر حکومەتە مەرکەزیەکانیان کە دووبارە وەکو ساڵانی ١٩٧٣ لە وزەش وەکی چەکێکی بەرهەڵستکاری دژی ئیسرائیل کەڵکوەربگرن و بەوشێوەیە پاڵپشتی خۆیان بۆ هێزی بەرهەڵستکاری لوبنانی دژی هێزی داگیرکەر دوپات بکەنەوە.

لە هەرێمی خۆشماندا بڕینی کارەبا و ڕێگەگرتن لە دانانی چارەسەرێکی گونجاو بۆ قەیرانی کارەبا لە لایەن گشت وڵاتانی جیرانمانەوە لە ساڵی ١٩٩١ وە تا ئەمڕۆکە پەرەپێدانی هەمان بیرۆکەی بەچەککردنی وزەیە دژ بە گەلێکی ئاشتیخواز. ئەم وڵاتانە بە لێکۆڵینەوەیەکی چڕو پڕ و داڕێژراو هەنگاو بۆ مەرامی هەرچی لاوازکردنی حکومەتی هەڵبژێردراوی کۆمەلامی خەڵک و لاوازکردنی ورەی جەماوەری ئاشتیخوازی کوردستان بۆ پەرەپێدان بەژیانێکی سەربەخۆیی دەدەن.

کە بە داخێکی زۆرەوە لە هەندێک ناوچەی هەرێمی کوردستان ئەم ڕامیارییە چەواشەییەی ناحەزانی ئەم بیرۆکە نوێیەی هەرێمی کوردستان جێ‌پێی خوی قاییمکردوە، چونکە نارەزایی کۆمەڵانی خەڵک لە ئاست نەبونی کارەبا بۆتە هۆکارێک بۆ دژایەتی و نارەزایی دژ بە حکومەتی هەرێم.

وە لە سەرەتایی وڵاتی ئێراقەوە تا ئەمڕۆ جێگیرنەکردنی هەر وێستگەیەکی ١٠٠ دەها مێگاواتی گەورەی وەرگێڕانی کارەباش لە هەرێمی کوردستاندا بە هۆی سیاسەتی چواشەی ڕژێمە یەکلەدوای یەکەکانی مەرکەزیشەوە بۆ پێکاندنی هەمان مەرامی بە چەککردنی وزەش دژی گەلەکەمان بووە.

## ٢.١ قەیرانی وزە لە كەنداودا و فشاری ناڕاستەوخۆی ئەمریكا بۆ سەر وڵاتانی چین، ژاپۆن و ئەوروپا

بەچەككردنی وزە هەروەكو چۆن لەبەشی ڕابوردودا ئاماژەی پێكرا ئەو هۆكارەیە كە زلهێزی جیهانی ئەمریكا ڕۆژانە پلانی بۆ دادەنێت و بەهۆیەوە گەمە بە گشت ئابوری جیهان دەكات.

لە نیو گشت وزە سەرەتایەكاندا وزەی نەوت و گازی بن زەویش پێگەیەكی لەبیرنەكراویان هەیە بۆ سەر دونیای پیشەسازی ئەمرۆكە و بەڕاشكاوی چەرخی خولێنەری پیشەسازی جیهانن. لە ڕاستیدا هیچ زلهێزێكی ئابوری جیهانی لە ڕۆژگاری كوندا و لە مرۆكەو لە داهاتوشدا نەیتوانیوەو ناتوانێت جێ پێگەی خۆی سەقامگیر بكات و بەردەوام بەهێز بمێنێت ئەگەر توانایی دەرهێنان و دەستبەسەراگرتنی شاڕێگای جوڵەی وزەی مادەفۆسیلیەكانی (نەوت و گازی) نەبێت.

لەم بەشەدا ئەو بابەتە شیدەكرێتەوە كە قەیرانی وزە واتە خوڵقاندنی گێژاوێكی دی نەوت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چ هۆكارێكی نابەجێ دەكاتەسەر پێشكەوتنی ئابوری كۆمەڵە وڵاتێكی پێشكەوتوی جیهانی. بۆ نمونە لەم بابەتەدا پابەندی كۆمەڵە وڵاتێكی وەكو ئەمەریكا، چین، ژاپۆن و ئەوروپا بە وزەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە

شیدەکرێتەوە. بەڵام لە بەشی ڕابوردوی ئەم پەڕاوەدا هەوڵدرا بەکورتی چاو بەسەر شرۆڤەکردنی ئەو پرسیارانەی وەکو هۆکارەکانی شەڕی ئێراق و ئەمەریکا وە پاشان ئایا وڵاتی ئێران لەم ڕۆژگارەدا پێویستی بە تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوی ئەتۆمی هەیە یان نا و گێژاوی نوێی ئێران و ئەمەریکا خشێنرا.

هەروەکو چۆن لە بەشەکانی ڕابوردودا ڕونکرایەوە، بەزۆری گشت زەخیرەی چاڵەنەوتەکانی دونیا کەوتۆتە ئەوبەشەی وڵاتەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ڕوسیا. لە ٦٥٪ گشت نەوتی بەکارهاتوی ڕۆژانەش لە کەنداوی فارسیەوە تێپەڕدەبێت.

لە هەمانکاتیشدا بەهۆی تایبەتمەندی جوگرافی وڵاتی ئێران وەهای کردوە کە کەنداوی فارسی لە ژێر ڕکێفی سەربازی کۆماری ئیسلامی ئێران دابێت و گشت نەوتەکەش بە هۆی تەنگەی هۆرمزەوە لە ژێر ڕکێفی ئێرانەوە ڕەتدەبێت. واتە هەر قەیرانێکی سەربازی لە دژی ئێران واتە شێواندنی باری هاتوچۆ لە تەنگەی هۆرمۆز و ڕاستەوخۆ خولقاندی قەیرانێکی دی وزەی بەدوادا دێت، کە چۆن گشت دونیا لە ساڵەکانی ١٩٧٣، ١٩٧٩ و ١٩٩١ دا دوچاری هات.




نەخشەی ٢.٢٢: جوڵەی نەوت (ملیۆن تەن) و پابەندی گشت دونیا بە نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە [٥]

لە نەخشەی ٢.٢٢ سەرەوەدا گرنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پێگەی گرنگی وڵاتی ئێرانمان بە تایبەتی تەنگەی هۆرمز لە بواری دەرهێنان و دابەشکردنی نەوت بۆ گشت دونیا بۆ ڕون بووەوە.

فاکتی سەرەکی ئەوە یە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چاڵەنەوتیەکانی ئێران تاکە کێڵگەی نەوتین کە لە ژێر ڕکێفی ڕاستەوخۆی هێزی سەربازی ئەمریکادا نین (بڕوانە هێڵکاری ٢.٢٣). هەر بۆیەش هەوڵی بەردەوامی ئەمەریکا ئەویە کە گشت ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و وڵاتی ئێران بەتایبەتی بخاتە ژێر ڕکێفی سەربازی خۆیەوە

تا بە وتەی خۆی ئەمریکا دۆلار چاپ بکات و گشت وڵاتانی پێشکەوتوی پیشەسازی دی بە هۆی هەمان دۆلاری ئەمریکیەوە نەوتی خاوی پێویستیان بە نرخێکی زیاد بکڕن، چونکە بەزۆری نەوت لە بازاڕەکانی دونیادا بە داروی دۆلار ئاڵوگۆڕی پێدەکرێت.

هەرچۆنێک لێکۆڵەرەوانی ڕامیاری وزەی جیهان هۆکاری هەڵگیرساندنی شەڕی ئێستاکەی ئێراق شیدەکەنەوە ئارەزوی خۆیانە، بەڵام فاکتی بەڵگەنەویست ئەوەیە کە گشت چاڵە نەوتیەکانی وڵاتی ئێراق ئێستاکە لە ژێر ڕکێفی سەربازی و ڕامیاری ئەمریکادایە. لە پاش گرژی دۆسییەی ئەتۆمی ئێران و هەڕەشەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئەم وڵاتە ئەگەری خولقاندنی ئاوەها قەیرانێکی دی وزە هەر ڕۆژ لە ناوچەکەدا لە هەر سات زێدەتر دەبێت.




هێڵکاری ٢.٢٣: زەخیرەی نەوتی خاو لە سەر ڕوی زەوی

بەلام لێرەدا هەڵوێستی ولاتانی چین، ژاپۆن و ئەوروپا ئەو بابەتەدە دەگەیەنن کە ئەمانە بۆ چارەسەرکردنی گێژاوی ئێران و ئەمەریکا ڕێچکەی گفتوگۆ دەگرنەبەر و هەردەم ڕێگە لە خولقاندنی قەیرانێکی دی وزە دەگرن. ئەم هەڵوێستە ئەو بابەتە ڕون دەکاتەوە کە چۆن بارودۆخی ئابوری ئەم ولاتانە بە وزەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە بەندە. هەر گێژاوێکی دی لەم ناوچەیەدا سستی و یاخود دارمانی ئابورری ئەو ولاتانەی بەدواوە دێت.

هەر بۆیەش گشت تەقەلایان لەگەڵ ئێران ئەوەیە کە ئەو ولاتە لە لایەکەوە مل بۆ خواستەکانی ئەمریکا کەج بکات تا جارێکی تر کەنداوی فارسی لە گێژاوی سەربازی بپارێزن و لە هەمان کاتیشدا چاڵە نەوتیەکانی ئێران ئاوەها بە بێلایەنی واتە دژ بە ڕاستای ڕامیاری ئەمەریکا بهێڵنەوە.

سەرەڕای ئەمانە ڕۆژانە بڕی ٨٥ ملێۆن بەرمیل نەوت لە جیهاندا لە گشت بوارەکانی پیشەسازیدا بەکاردێت و بڕی ٤١% لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە دێت. سەرەکیترین ولاتی سوتێنەری نەوتی دونیا ئەمەریکا یە کە پێویستی بە ڕۆژانە ٢٠.٥ ملێۆن بەرمیل نەوتە. کە ئەم بڕەش زۆری لەلایەن خۆیەوە بەرهەم دێت. ڕاستە ولاتی ئەمەریکا وەکو زلهێزی سەربازی و تەکنۆلۆجای ئەمرۆکە یەکێکە لەو ولاتانەی کە زۆرترین نەوتی دوینا لە ولاتەکەی خۆیدا بەرهەم دێنێت لە هەمانکاتیشدا بەهۆی مەزنی باری پیشەسازیەکەیەوە یەکێکە لەو ولاتانەی کە زۆرترین بری نەوتی دونیا لە

دونیای دەرەوە دەهێنێتە نێو وڵاتەکەی خۆیەوە. بە پێی ئامارەکان ئەمریکاییەکان لە ١٧% گازی سروشتی و ٥٨% نەوتی خاوی بەکارهاتوی ڕۆژانەی ئەم وڵاتە لە وڵاتەکانی دی وە دەهێننە نێو خاکەکەیانەوە.

لە پلەی دووەمدا وڵاتی چین دێت کە ڕۆژانە پێویستی بە ٦ ملیۆن بەرمیلە و ئەم بڕەش بەهۆی بەرەوپێشچونی باری ئابوری وڵاتەکەی هەر لە هەڵکشاندایە، پاشان وڵاتی ژاپۆن دێت کە ڕۆژانە پێوستی بە نزیکەی ٥،٥ ملیۆن بەرمیل نەوتی خاو هەیە. بۆ نمونە وڵاتی ئەڵمانیا کە چوارەمین وڵاتی پیشەسازی دونیایە پێوستی ڕۆژانەی تەنها بە ٢.٢٤ ملیۆن بەرمیل نەوتی خاوە.

لە هێڵکاری خوارەوەدا بڕی پێویستی نەوت بۆ وڵاتی ئەمریکا خراوەتەڕو، بەهۆی گەشە سەندنی ساڵانەی توانای تەکنۆلۆجیاو هەڵکشانی بڕی دانیشتوانی وڵات بڕی وزەی پێویستیش بۆ وڵات ساڵ لە دوای ساڵ بەرەو سەرێ هەڵدەکشێ.

لە هەمانکاتیشدا نەوتی بەرهەمهاتوی خۆماڵی لە ساڵەکانی ١٩٨٠ وە بەرەو کەمی دەچێت، هەروەها لەهەمان ساڵەوە وابەستەیی ئەم وڵاتە بە بڕی هێنانە ناوەی نەوتی دەرەکی زیادی کردوە.




هێڵکاری ٢.٢٤: هەماهەنگی لە نێوان بڕی نەوتی بەکارهاتو، بەرهەمهاتو لەگەڵ هاوردەلەلایەن وڵاتانی دیەوە بۆ نێو ئەمەریکا

بەڵام تەنها نزیکەی ٢٠% نەوتی ئەم وڵاتە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دێت (ئیمارات، عەرەبستانی سعودی لەگەڵ ئێراق). واتە ٧٨% لە کۆمەڵە وڵاتێکی دیەوە (مەکسیک، ڤینوزویلا، کەنەدا، نێجیریا، ئێکوادۆر) دەهێنێت، کەواتە تەکنۆلۆجیایی پێشکەوەتوی ئەم وڵاتە بۆ داهاتویەکی نزیک بە وزەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە نەبەستراوەتەوە.

وە هەروەها لەم هێڵکاریەدا ڕونکراوەتەوە کە لە چ وڵاتانێکەوە نەوتی ڕووژانەی وڵاتی ئەمریکا دەهێنرێتە نێو وڵات. تەنها نزیکەی ٢٠% نەوتی ئەمەریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دێت.




هێڵکاری ٢.٢٥: ئەو وڵاتانەی نەوت بەرەو ئەمریکا دەنێرن

بەڵام بە چاوخشاندا بە هێڵکاری ٢.٢٦ ئەوەمان بۆ ڕون دەبێتەوە کە زەخیرەی نەوتی خاوی وڵاتی ئەمریکا بە لوتکەی بەرهەمهێنانی خۆی گەیشتوە و ئیدی لە ساڵەکانی ٢٠٠٠ وە بەرەو کەمبونەوە دەچێت و یەدەگی نەوتی خاوی ئەم وڵاتە تا ساڵەکانی ٢٠٢٠ بەرگەدەگرن.




هێڵکاری ٢.٢٦: بڕی بەرهەمهێنانی نەوتی خاو و یەدەگی نەوتی خاو لە دونیاو وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دا [٦]

هەر بۆیەش بۆ داهاتویەکی دور نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تاکە پێویستیەکی بەڵگە نەویستە بۆ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیایی پیترۆشیمی ئەو وڵاتە و هێشتنەوی ئەو وڵاتە وەکو تاکە زلهێزی سەربازی، تەکنۆلۆجیایی و ئابوری لە سەرتاسەری دونیادا. بەڵام ئەو کۆمەڵە وڵاتەی تریش بۆ پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیایی ڕۆژانەیان پێویستیەکی ڕۆژانەیان بە نەوتی خاوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هەیە.

لە ڕویەکی دیەوە وڵاتی ژاپۆن کە سێهەمین وڵاتی تەکنۆلۆجیایی جیهانە بەڕێژەیەکی زۆر بە وزەی نێو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وابەستەیە، وەئەم دیاردەیە لە هێڵکاری ٢.٢٧ دا دوبارە نیشان دراوە. سەرەڕای ئەمانەش ژاپۆن بەهۆی بونی کێشەی کۆنی دورگەکانی کۆرِیل کە

لەگەڵ ڕوسیادا هەیەتی مل بۆ نەوتی وڵاتی ڕوسیا کەچ ناکات واتە تاکە دەرەتانی تەنها وزەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە.




هێڵکاری ٢.٢٧: چۆنێتی پابەندی کۆمەڵە وڵاتێک بە نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە

لەم هێڵکاریەدا بەرچاو دەکەوێت کە وڵاتی ژاپۆن بەڕێژەی زێدەتر لە ٧٠% و وڵاتەکانی ئەروپای ڕۆژئاوا بە ڕێژەی ٥٠% بە نەوتی خاوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە پەیوەستن.

کەواتە هەر گێژاوێک لە گۆڕانکاری بەردەوامی گەیاندنی وزە بۆ وڵاتی ژاپۆن مەزنترین هۆکاری نابەجێی بۆ سەر بارودۆخی پیشەسازی و ڕاستەوخۆ ئابوری ئەو وڵاتەی لێدەکەوێتەوە. وڵاتی ژاپۆن ڕۆژانە تەنها ٢٠% گشت نەوتی پێویستی خۆی لە کۆمەڵە وڵاتێکی تر وەکو (نێجیریا، ئەندۆنوزیا و چین) وە دێنێت کە ئەوانیش لە ڕوانگەی زەخیرەی ژێرزەوی و تەکنۆلۆجیای بەرهەمهێنان توانایی بەرەوسەربردنی ڕێژەی بەرهەمهێنانی نەوتی ڕوژانەی خۆیان نییە.

واتە بەس چەند وڵاتێکی نێو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (ئێراق) و ڕوسیا بە هۆی زەخیرەی بێشوماریانەوە دەتوانن ڕێژەی ڕۆژانەی بەرهەمهێنانی نەوتی خۆیان بەرەو سەرێ بەرن، نەک وڵاتانی تری دونیا.

لە هێڵکاری ٢.٢٨ خوارەوەدا ئەو بارودۆخی پابەندی وڵاتی چین کە دووهەمین وڵاتی تەکنۆلۆجیایی جیهانە بە وزەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕوندەکاتەوە. کەواتە ئەو وڵاتە بەڕێژەی ٥١% بە وزەی نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیوەستە. شایەنی باسە وڵاتی چین خۆشی خاوەنی ٦% زەخیرەی نەوتی جیهانە.

بەڵام شێواندنی ڕێچکەی گەیاندنی وزەی نەوتی خاو بۆ وڵاتی چینیش دەبێتە هۆی شڵەژاندی ڕاستەوخۆی باری ئابوری ئەو وڵاتە.







هێڵکاری ٢.٢٨: وابەستەیی وڵاتی چین بە نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە

بەسەرنجەوە گشت فاکتەکان ئەو بابەتە بەڵگە نەویستە ڕوندەکەنەوە کە چۆن هەر گێژاوێک لە کەنداوی فارسیدا دەبێتە هۆی خولقاندنی مەزنترین گێژاوی وزە بۆ ئەو گشت وڵاتە پێشکەوتوانەی دونیا کە بەهۆیەوە ڕاستەوخۆ دوچاری گێژاوێکی مەزنی ئابوری دەبن، کە کاردانەوەکانیشی بەهۆی ئەزمونی قەیرانەکانی ساڵانی ١٩٧٣، ١٩٧٩ وە ١٩٩١ بۆ گشتمان ئاشکرایە.هەر بۆیەش تا دواپلەی توانایان ئەم گشت وڵاتانە ڕێگە لە خولقاندنی ئاوەها گێژاوێکی دی لە کەنداوی فارسیدا دەگرن. بەڵام هیچ یەک لەم وڵاتانە توانیای بەربەرەکانی ئەمریکایان نی یە کە مەزنترین هێزی سەربازی و ئابوری لەپشتە و لە هەمانکاتیشدا باری ئابوری ئەمەریکا ڕاستەوخۆ بە هیچ گۆڕانکاریەکی ئەم ناوچەیەوە بەند نی یە و تاکە سودمەندی ئەو گێژاوەی وزانەشە.

## ٣. مێژووی نەوت و گاز لە ئێراقدا و هۆکاری داگیرکاری لە سەریان




### ٣.١: نەوتی کوردستان و ئەو شوێنانەی ئەگەری نەوتی هەبێت

ئێراق وەکو یەکێک لە هەرە وڵاتە گرنگەکانی نێو دەڤەری ڕوژهەڵاتی ناوەڕاست بەهۆی تایبەتمەندی جیۆگرافی پێکەوەلکانی هەرچوار نەتەوەی گرنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (کورد، عەرەب، تورک، فارس) و سامانە سروشتیەکانی (نەوت و گاز، ئاوی شیرینی دیجلەو فوڕات،

شوێنە دینی، مێژوویی و ئەسەریەکان و بەپیتی کشتوکاڵی زەویەکەی لە میزۆپۆتامیادا) هەردەم لە ژێر چاودێری و خواستی گشت وڵاتە زلهێزەکانی دونیا دابووە و لە داهاتوشدا هەر ئاوەها دەمێنێتەوە.

لەمێژەوە بڵێسەو ئاگرێکی جوان لە ناوچەی بابەگوڕگوڕەوە هەستاوە ئەم ناوچەیە هەرلە سەرەتای ژیانی مرۆڤەکان لە وڵاتی میزۆپۆتامیادا پیرۆزیەکی تایبەتی خۆی هەبووە و خەڵکی ناوچەکە وەکو مەزارگەیەک لەم ناوچە پڕ ئاگرەیان دەڕوانی. دەگێڕنەوە کە ژنانی کورد بۆ پاڕانەوە لە سەردانی ئەم مەزارگەیەدا وتویانە "بابەگوڕگوڕ بە گوڕ هاتم بۆ کوڕ هاتم".



نەخشەی ٣.٢ : بڵێسەی هەمیشەی لە ناوچەی پڕئاگری بابەگوڕگوڕ

دیارە هۆکاری ئەم ئاگرە هەمیشەی یە سوتاندنی سامانی سروشتی هایدرۆکاربۆنی‌یە لەو ناوچەیەدا.

لە سەرەتاکانی خولقاندنی ئەم وڵاتەوە (١٩٢٠) تا ئەمڕۆ بەهۆی سیاسەتی چەوتی زلهێزەکان (بەریتانیای گەورە، ئەمەریکا و ڕوسیای کۆن) و بیرشۆڤێنی کاربەدەساتنی ڕامیاری ناوخۆ نەتوانراوە چوارچێوەیەکی پایەدای سیڤیلی بەم وڵاتە بدرێت، هەربۆیەش هەردەم حکومەتە یەک لەداوی یەکەکانی ئەم وڵاتە یان بەهۆی کودەتا سەربازیەکانەوە ڕوخاون یاخود ئاودالّی دەستی دکتاتۆریەت بون.

چونکە ئەوەی حکومەتی یەکەمی بەدەستی هێنابوو لە لەیەن دەوڵەتی دوەمیەوە هەڵوەشینراوەتەوە و ساڵ بە ساڵ وڵات دوچاری شەر دژی دراوسێکانی کراوە چونکە بونیادنانەوەی ئەم وڵاتە تائەمڕۆ تنها لەسەر خواستی گروپێکی بالآدەست و بیرۆکەیەکی شۆڤێنی بووە نەک بۆ خواستی گشت کۆمەلانی خەڵکی ئەم وڵاتە چ بەعەرەب و کورد یاخود چ بە سونی و شیعە وە. کەواتە لەسەرەتای خولقاندنی ئێراقەوە ئەم وڵاتە نەک بۆتە سیمبۆلی ئاشتی بۆ هاوڵاتیانی بەڵکو بۆتە بنەمای نەگبەتی و شەر بۆ گشت دراوسێکانیشی. بە هۆی قەیرانە بەردەوامەکانی ساڵ بەساڵ بەرهەمی سامانە سروشتییەکانیشی بەفیڕۆ چووە.

بەڕاشکاوی پایەداری وڵاتێک کاتێک دێتەدی کە بنەمای خوڵقاندنی لەسەر خواستی گشت کۆمەڵانی ئەو دەڤەرەبێت بە بێ جیاوازی ڕەگەز و ئاین، نەک خواستی گروپێکی ڕەگەز و ئاینی تایبەتی.

تەکنۆلۆجیای نەوتی ئەم وڵاتەش بە هەمان شێوە لە ژێر کارتێکەری خراپ و کاولکاری ئەو هۆکارانەی سەرەوە دا بووە. هەر بۆیەش پاش ١٠٠ ساڵ تەجروبەی وەدەرهێنانی نەوتی لەم وڵاتەدا لە کاتی وەدەرهێنانی نەوت لە دەڤەری نەوتخانە، لە ساڵی ١٩٠٩ بەهۆی کۆمپانیای نەوتی تورکی (Turkish Petroleum Company)، تائەمڕۆ لە بواری پیشەسازی و وڵاتدایەوە دۆڕاوتیرین و پەڕپوتترین وڵاتین لە نێو ئەو گشت وڵاتانەی جیرانمان و ئەوانەی کە خاوەنی نەوتن لە جیهاندا.

مێژووی پەرەپێدانی نەوتی خاوی ئێراق لە ساڵەکانی ١٩٠٩ وە دەستپێ دەکات، کە سەرزەمینی ئەمڕۆی ئێراق بە هەرسێ ولایەتەکانی موسڵ و بەغداد و بەسرە وە بەشێک بو لە وڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی. لەو زەمانەدا سەرمایەدارێکی ئەرمەنی بەناوی گولبەنکین هەستی بەوە کردبوو کە لە ولایەتی موسڵ سەرچاوەی نەوتی خاو هەیە بۆیە لەو کاتەدا کۆمپانیای نەوتی تورکی TPC ( Turkish Petroleum Company) بە هاوکاری بەریتانیەکان UK & Dutch Oil Coدامەزراندو کاری بەدواگەڕانی نەوتی لە

دەڤەری خانەقین دا دەست پێکردو بەسەرکەوتویی کۆمەڵە کێڵگە نەوتی بچوکی لە ناوچەی نەوت خانە دۆزیەوە.

لەو کاتەشدا پێش دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی لە ساڵەلانی ١٩١٢ و ١٩١٣ هێزی دەریایی بەریتانیا بۆ گشت کەشتیەکانی بۆ بەرزکردنەوەی هێزی شەڕی دەریای لە بری خەڵوزی بەردین نەوتی بەکارهێنا، کە ئەم گۆڕینی وزەیەش پێویستی ڕۆژانەی حکومەتی بەریتانیای بە نەوتیخاو بەرەوسەرێ برد، بۆیە ئەوانیش بەدوای سەرچاوەی نوێی زەخیرەی نەوتی خاو دا دەگەڕان.

لێرەوە بەرەودوا نەوتی خاو وەکو فاکتەرێکی ئابوری سیاسی بۆ داگیرکردنی ڕوبەی ئەوکاتەی ئێراق لە نێو هاوکێشەڕامیاریەکاندا سەری هەڵدا. هەرچەندە لە ساڵی ١٩١٢ حکومەتی بەریتانیا بۆندێکی دابینکردنی نەوتی بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لەگەڵ شای ئێران و کۆمپانیای ئەنگلۆ پێرسیەن دا (Anglo-Persian Co.) مۆرکردبوو، بەلاّم بەریتانیا هەردەم لە ناوچەی دورگەی فارسیدا بەدوای سەرچاوەی نوێی نەوتی خاو لە دەڤەری ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا دەگەڕا.

هەر لەبەرئەوهۆیانەی سەرەوە بوو کە هەندێک لە مێژونوسانی بواری وزە سەرەتای ئامادەکاری تەکنیکی و دۆزینەوەی کێڵگەی بابەگوڕگوڕ دەگێڕنەوە بۆ خولقێنەری کۆمپانیای نەوتی تورکی، کە مرۆڤێکی زیرەکی

سەرمایەداری بەڕەگەز ئەرمەنی بوو بەناوی گولبەنکین (Galouste Sekis Gulbenkian 1867-1955). ئەم مرۆڤە پاش هەڵوەشانەوەی TPC بە جەنابی ٥% ناسرا.

لە ساڵەکانی شەڕی جیهانی یەکەم دا گشت کارەکانی بەدواگەڕانی نەوت لە ئێراقدا ڕاگیرا، پاشان لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم هەمان کۆمپانیا وەکو دەستکەوتێکی شەر دابەشکراو لە ساڵی ١٩٢٥ کاری بەدواگەڕان و دەرهێنانی نەوت لە ئێراقدا دەستی پێکردەوە بەڵام ئەمجارە کۆمپانیاکە لە ژێر ناوی کۆمپانیای نەوتی ئێراقی IPC کاری دەکرد (Iraq Petroleum Company). وە لە سەدا ٥% ئەم کۆمپانیایە درا بە گولبەنکین.

کۆمپانیای IPC کەوتەژێر خاوەندارێتی کۆمەڵە کۆمپانیایەکی نەوتی گەورەی جیاهانی (دەستە خوشکەکان کە نەوتی گشت زەویان قۆرغ کردبوو ) وەکو ( BP, CFP(total), Shell, Esso and Mobil, Partex وە ئەم کۆمپانیایەش لە ناوچەی بەسرە کۆمپانیای BPC ( Basra Petroleum Company) خوڵقاند. کۆمپانیای IPC دەستی بەسەر گشت ناوچەکانی ئێراق دا زاڵ کرد و کێڵگە زەبەلاحەکانی نەوتی کەرکوک و ڕومێلەی دۆزیەوە.

هەروەکوچۆن لەونەخشەی ئیراقدا بەدەردەکەوێت، شاری کەرکوک کە نزیک زنجیرە چیای زاگرۆسە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی ئێراق و سەر بە خاکی کوردستانە، بەڵام نەکەوتۆتە چوارچێوەی جوگرافی ئەمڕۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان. ئەم شارە نزیکەی ٦٠٠ هەزار دانیشتوانی هەیە و ٢٥٠ کیلۆمەتر لە پایتەختی وڵاتی ئێراقەوە دورە.

بۆ نمونە خودی کێڵگەی کەرکوک ١٣% گشت نەوتی ئامادەبۆبەرهەمی وڵاتی ئێراقی لە خۆ گرتووە. بە پێی مەزندەی زۆربەی پسپۆڕانی بواری نەوت کێڵگەی بابەگوڕگوڕی کەرکوک بڕی Barrel G ١٦ ملیارد بەرمیل نەوتی خاوی لەخۆگرتووە و درێژی کێڵگەکەی نزیکەی km ١٠٠ کیلۆمەتر و پانیەکەشی لە نێوان (٣ تا ٤) کیلۆمەتر دەبێت. ئەم کێڵگەیە یەکێکە لەو ١٠ هەرە کێڵگە گەورەکانی جیهان.

بە هۆی گرنگی نەوتی کەرکوک لە مێژووی وڵاتی ئێراقدا لە چەند دێڕێکدا باسی دۆزینەوەی نەوتی کەرکوک لە زاری یەکێک لەو ئەندازیارانەوە دەکەین کە لە ساڵی ١٩٢٧ دا لە لێدانی بیری یەکەمدا بەشدار بووە [٢٧].




نەخشەی٣.٣ : کێڵگەی کەرکوک و چاڵە نەوتیەکانی چواردەوری

ئەندازیاری ناوبراو باسی ئەو ڕوداوەدەکات کەلە بەرواری ١٤.١٠.١٩٢٧ دا ڕویداو کۆمەڵە وێنەیەکیشی گرتووە.

دەگێڕێتەوە کە، لەکاتی تەواو بونی کاری لێدانی بیرەکەدا بوین کە دەنگێکی مەزن وەکو هەورەگرمە بەهۆی فشارێکی نێو بیرەکەوە وەکو فوارە، کە بە (Blow-out) ناسراوە، نەوت وگاز و گشت خۆڵی نێو بیرەکە هاتە دەرەوەو بەبەرزیەکی ٤٠ مەتری هەورێکی ڕەشی خولقاند و وەکو ئەژدیها هاواری دەکردو دەی نرکاند. دەنگ و ناڵەی ئەو بیرە دەیویست ئەوە بڵێت، کە ئەگەر ئێوە ژیر و هوشیاربن دەبێت دەست نەدەنە نەوتی ئەم دەڤەرە.



وێنەی ٣.٤: فوارەی نەوت و گازی سروشتی لە بابەگوڕگوڕ
(***BP Archive/BP plc***)

ئەو فوارەیە گشت ئامێری بورجی هەڵکەندنی (Rig) بیرەکەی شکاند و چەند کیلۆمەترێک لەولاوە کەوتنەخوارەوە. نەوتیش لە بیرەکەوە هەڵدەقوڵا وەکو ڕوبارێکی ترسناک بەرەو شار لە جوڵە دابوو کە سات لە دوای سات ترسی ئاگرگرتنی زۆرتر دەبوو.



وێنە ٣.٥: ڕوباری هەڵقوڵاوی نەوتی کەرکوک لە جوڵەدا بەرەو شار

ئەگەر ئەوڕۆژە نەوتی کەرکوک ئاگری بگرتایە، بێگومان خەڵکانێکی زۆر توشی گرفتاری گەورە دەبوون. ئەم ڕوداوە بۆ گشت ئەندازیارانی ئەو سەردەمە شتێکی کەم وێنە بوو، وە هیچ کەس بۆ دامرکاندنەوەی ئەم فوارەیە ئەزمونی نەبوو، بەڵام بۆ ڕێگرتن لە ئاگرگرتنی دەبوایە بەشێوەیەکی خێرا هاتنەدەرەوەی نەوت و گازەکە دابمرکایایەوە. تا دامرکانەوەی ئەو فوارەیە گشت دەفەرەکە بە نەوتی ڕەش داپۆشرا.

لەو وێنە مێژوویەی خوارەوەدا پاسەوانێکی بەرەگەز هیندی دەبینین کە پارێزگاری لە بورجی هەڵکەندنی یەکەمین بیری کێڵگەی کەرکوک دەکات لە ناوچەی بابەگوڕگوڕ.



وێنە ٣.٦: پاسەوانێکی هیندی بۆ پارێزگاری لە بورجی بیری نەوتی کەرکوک

پاشان ساڵی ١٩٦٤ حکومەتی ئەوکاتەی ئێراق کۆمپانیای (Iraq National Oil Company) INOC خوڵقاند و کێشەی ڕامیاری و ئابوری ڕاستەوخۆ کەوتە نێو کاربەدەستانی ڕامیاری وڵات و کۆمپانیا زلهێزەکانەوە کە تا ئەمڕۆکەش گشت کۆمەڵانی خەڵک بەدەستیەوە دەناڵێنن.

هەر ئەنجامی ئەو کێشانەش بوو کە لە ساڵی ١٩٥٨ لە پاش کودەتای قاسم دەستی کۆمپانیا بیانیەکان و ئینگلیسەکان کورتکرایەوە و لە ساڵی ١٩٧٢ کۆمپانیای IPC بۆ خاوەندارێتی ئێراق گەڕایەوە و بوە خۆماڵی و گشت تواناکانی درا بە کۆمپانیایەکی خۆماڵی بەناوی ICOO (Iraqi Company for Oil Operations). بەشێوەیەکی گشتی خودی وڵاتی ئێراق بەهۆی وەزارەتی نەوتەکەیەوە بە تەنیایی و مۆنۆپۆل لە ساڵی ١٩٧٥ وە تا ٢٠٠٣ بە شێوەیەکی سەربەخۆ کاری گەڕان و ناردنەدەرەوەی نەوتی لە ئەستۆدا بوو.

## خشتەی ٣.١: کۆمەڵە زانیاریەکی تایبەتی لە بارەی جاڵە نەوتیەکانی وڵاتی ئێراق

| | |
|---|---|
| ژمارەی چاڵە دیارەکان | ٥٣٠ |
| ژمارەی چاڵە هەڵکەنراوەکان | ١١٥ |
| ژمارەی کێڵگە ناسراوەکان | ٨٠ |
| ژمارەی کێڵگە بەرهەمهێنەرەکان | ٢٣ |
| ژمارەی کێڵگە ڕوپێووکراوەکان | ٨٠ |
| پاشەکەوتی چاوەڕوانکراوی تا٢٠٠٠/١/١ | ٤٤٧ ملیارد بەرمیل |
| بڕی نەوتی خاوی بەرهەمهاتو تا ٢٠٠٦/١/١ | ٣٠.١ ملیارد بەرمیل |
| بڕی زەخیرەی باوەڕپێکراو چاوەڕوانکراو تا ٢٠٠٦/١/١ | ١٢٠ ملیارد بەرمیل |
| بڕی زەخیرەی خەمڵێنراو | ٢١٤ ملیارد بەرمیل |

لە خشتەی سەرەوە دا کۆمەڵە زانیاریەکی تایبەتی خراوەتەڕوو. سەرچاوەی ئەم زانیاریانە وەزارەتی نەوتی ئێراقە. گرنگی ئەو ژمارانەی سەرەوە بۆ خوێنەری هەرێمی کوردستان سەرەتا ئەوەیە کە ئێمەش لە هەرێمەکەی خۆماندا خاوەنی بڕێکی زۆری نەوتی خاوین، بەڵام لە نێو ئەو گشت کێڵگە بەرهەم هاتوانەی نێو والاتی ئێراقدا تاکە کێڵگەیەکی نەکەوتۆتە نێو چوار چێوەی جوگرافی هەرێمی کوردستانەوە (بێجگە لە کێڵگەی نێو دەڤەری کەرکوک).

بە پێی خشتەی ٣.١ تا ئێستا ٣٠ ملیارد بەرمیل نەوتی خاو لە نێو وڵاتی ئێراقدا دەرهێنراوە. ئەگەر چاو بە ڕێژە و چەندایەتی دەرهێنانی نەوتی وڵاتی ئێراقدا بخشێنین بە ساکاری دەتوانرێت لەم لێکدانەوەیە و شرۆڤەیەدا مێژووی ئەم وڵاتەمان بکەوێتە دەست.

بەهۆی هێڵکاری ٣.٥ وە دەتوانین ئەو بابەتە بسەلمێنین کە چۆن دەرهێنانی نەوتی ئێراق پەیوەندیەکی لێکنەپچڕاوی بە گشت بارودۆخە سیاسیەکانی ئەو وڵاتەوە هەیە. لێرەدا تەنها چاو بەو گۆڕانکاریانەدا دەخشێنرێت کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە بارودۆخی سیاسی هەرێمی کوردستانەوە هەیە. هەروەها ئەوش دەسەلمێنرێت کە چۆن بەهۆی نەبونی چوستی باش لە ئامێرەکانی وەرگێڕانی وزەو هەرزانی نەوت و بێبەرنامەیی لە سودوەرگرتنی نەوتی خاو لە ناوخۆدا چۆن ساڵ لە دوای ساڵ بڕی بەکارهێنانی

ناوخۆیی بەرەوسەرێ هەڵدەکشێت، کە ئەمەش زیانی مەزن بەبڕی ناردنەدەرەوی نەوتی خاو دەگەیەنێت.

لەسەرەتای ساڵەکانی ١٩٧٤ دا کە گرژیەکی بەردەوام لە نێوان حکومەتی ناوەندیی و شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلەکەماندا هەبوو، بەوبۆنەیەوە وڵاتی ئێراق توانای دەرهێنای زۆر لەخوارەودا بوو.

لە پاش ڕێکەوتنی ١٩٧٥ لە جەزائیر و نسکۆی شۆڕشی ئازادیخوازی کوردستان بە هۆی ئەو پلانە نێودەوڵەتیەوە توانرا تاڕادەیەک توانای دەرهێنانی نەوتی ئێراق لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٩ دا بۆ نزیکەی ٣،٧ ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا ببرێتەسەرەوە. ئەم بڕە ترۆپی توانای مێژوویی ئەو وڵاتە یە کە تا ئیستا پێیگەیشتبێت.

پاشان داسەپاندنی شەڕ دژی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ توانای ئەم وڵاتەی بۆ نزیکەی ٩٠٠ هەزار بەرمیل لە ڕۆژێکدا دابەزاند. بەڵام بەهۆی ئاگربەستی نێوان ئەم دوو وڵاتە لە ساڵی ١٩٨٨ دا توانرا جارێکی دی توانای دەرهێنانی نەوتی خاو بەرەو سەرێ هەڵکێشرێ.

لە ١٩٩١ دا پاش هێرشی نارەوای ئەم وڵاتە بۆ سەر دراوسێییەکی تر، وەکو وڵاتی کویەت و هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینە جەماوەریەکەی باشور وباکوری وڵات، توانای دەرهێنای نەوتی خاو لە ئێراقدا بۆ کەمترین ئاستی مێژوویی دابەزاند و گشت وێستگەکان داخران.




هێڵکاری ٣.٧: توانای دەرهێنای نەوتی ئێراق لە ماوەی ٣٠ساڵدا [٧]

بەهەمان شێوەش بەهۆی (Oil-for-food) بڕیاری فرۆشتنی نەوتی خاوی ئێراق بۆ خوراک لە لایەن نەتەوە یەکگرتوەکانەوە U.N. Resolution 986، ئەم وڵاتە توانی توانای دەرهێنانی نەوتی خاوی خۆی بەرەو سەرێ بەرێت.

هەربۆیەش لە چوارچێوەی ئازادکردنی وڵاتی ئێراق لە دەست ڕژێمی دیکتاتۆری لە بەهاری ساڵی ٢٠٠٣ دا توانای دەرهێنانی نەوت لەم ولاتەدا جارێکی تر بەرەو نزمترین ئاستی خۆی دابەزی. سەرەڕای ئەمانە بەپێ هێڵکاریەکە بڕی پێویستی نەوتی ناوخۆی ئێراق بەهۆی خراپی باری

پیشەسازی هەمیشە زۆر کەم بووە.

سەرئەنجام پەیوەندی گشت بارودۆخی سیاسی ئەم وڵاتە بە نەوتی خاوەوە دیاردەیەکی حاشا هەڵنەگرە. زۆربەی کۆسپە ڕامیاریەکان لەم وڵاتەدا لە هەڵقوڵاو و دەرئەنجامی ئەو دژایەتی کردنی مافی ڕەوای گەلی کوردوەیە لەلایەن حکومەتی ناوەندیەوە. هەر بۆیەش زامنکردنی ئاسایشی وڵات کاتێک دێتە دی کە گەلی کوردیش وەکو گەلی عەرەب خۆی بە هاووڵاتی پلەیەکی ئەم وڵاتە بزانێ.

لە چاو دەرهێنانی نەوتی خاو لە ئێراقدا بڕی نەوت بۆ سودلێوەرگرتنی خۆماڵی لە ساڵی ١٩٨٠ کە ٢٥٠٠٠٠ بەرمیل لە ڕۆژێکدا بوو. تا ساڵی ٢٠٠٥ ئەم برە بۆ ٦٠٠٠٠٠ بەرمیل لە ڕۆژێکدا هەڵگەڕا.

بە پێی World Oil لە ساڵی ٢٠٠٢ دا وڵاتی ئێراق بە زخیرەیەکی ١٧ Gt نەوت واتە ١١٥ تا ٢٠٠ ملیارد بەرمیل کە ڕێژەی ١٢% لە پاش وڵاتی عەرەبستانی سعودی دوهەمین وڵاتی خاوەن نەوتی جیهانە [١٠]. بەپێی ئامارەکان لە وڵاتی ئێراقدا ١١٥ ملیارد بەرمیل نەوتی دۆزراوە و ٧٥ ملیارد بەرمیلیش هێشا نەدۆزراوەتەوە.

کوردستانی خۆشمان بەپێی ئامارەی زۆربەی پسپۆڕانی بواری وزە و نەوت بەڕێژەی سەروتر لە ٤٠% نەوتی ئێراقی لەخۆگرتوە و بەداخەوە بەهەمان شێوە لەژێر کارتێکەری بیرۆکەی شۆڤێنی یەک لەدوای یەکەکانی کاربەدەستانی

ڕامیاری ئەم وڵاتەدا نالاندویەتی.

تا ئەمڕۆکەش هیچ یەک لە کۆمپانیا زلهێزەکانی دونیا خواستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانیان لە ئێراق بە فەرمی نەناسیوە و بەهەمان شێوەش کاربەدەستانی ڕامیاری حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی ئێراق ویستویانە کە خاکی کوردستان و هاوڵاتیانی لە تەکنۆلۆجیای نەوتی بەدور بگرن. جگە بەتاڵان بردنی نەوتی کەرکوک ڕێگەیان بە هیچ کۆمپانیایەکی بیانی و ئێراقی نەداوە کە لە ناوچە کوردنشینەکان دا سەرمایەگوزای بکات و تەکنۆلۆجیای نەوت ببوژێنێتەوە.

بۆ نمونە حکومەتی ئێراق لە جیاتی ئەوەی کە سامانی گاز و نەوتی ناوچەکانی هەڵەبجە بخاتە خزمەت هاوڵاتیانەوە، هاتووە بە پارەی دزراوی نەوتی کەرکوک لە ساڵی ١٩٢٧ وە پەرەی بە سیاسەتی ڕەگەزپەرستی و پاشانیش لە ساڵەکانی ١٩٨٠ کانەوە پەرەی بە تەکنۆلۆجیای چەکی کیمیاویی داوە و هاوڵاتیانی هەڵەبجەی جینۆساید کردووە.

هەربۆیەش لە سایەی ئەم حکومەتە شۆڤێنیانەدا لە ئێراقدا هیچ تەنکنۆلۆجیای نەوت و گاز لە کوردستاندا پەرەی پێنەدراوە و لە هەمانکاتیشدا ڕێگەیان لە گشت قوتابیانی کوردستان دەگرت کە لەو بوارانەدا پەرە بەخوێندن بدەن. کە بەداخەوە تائەمڕۆکەش ئەم سیاسەتە

بەهەمان شێوە لەلایەن ئەو وڵاتانەی دیشەوە کە بەشێکی خاکی کوردستانیان لە خۆ گرتووە پەرە پێدەدرێت، واتە لەهیچ پارچەیەکی ئەم کوردستانە ڕێگە بە قوتابیانمان نەدراوە لەسەر خواستی خۆیان لە بواری تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوو بەگشتیو نەوت و گازدا بەتایبەتی شارەزابن.

کەواتە میراتی ١٠٠ ساڵەی نەوت لە ئێراقدا ئەمڕۆ بۆ هەرێمی کوردستان ئەوەیە کە خاوەنی هیچ کادیرێکی شارەزا لەوبوارانەدا نین. هەر بۆیەش ئەرکی ئەمڕۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەگشتی و وەزارەتی پەیوەندیدار بەتایبەتی ئەوەیە کە دەرفەت بۆ قوتابیانی کوردستان بخوڵقێنێت کە لەو بوارانەدا خۆیان پێبگەیەنن تا لە دواڕۆژدا ئێمەش وابەستە بە هێزی کراوی نێو وڵاتە بیانیەکان نەبین. تا لە داهاتودا خۆمان وەکو گشت کۆمەڵانی ئەم دەڤەرە توانای وەدەرهێنان و بەرەوپێش بردنی تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی خۆمان هەبێت، ئەویش کاتێک دێتەدی کە لە ئێستاوە قوتابیانی خۆمان بۆ داهاتو پێبگەیەنین.

بە پێی یەکێکی تر لە ئامارەکانی ( USA Energy Information Administration: EIA 2002) نزیکەی ٧٣ کێڵگەی نەوتی لە ئێراقدا ناسراوە. وە لەم برەدا تەنها ٢٣ کێڵگەی نەوت لەقۆناغی ئەکتیڤی بەرهمهێنان دابوون (EIA 2002). بێجگە لە کێلگە نەوتیەکانی چواردەوری کەرکوک حکومەتە شۆڤێنیەکانی ئەوسای ئێراق پەرەی بە چاڵەنەوتیەکانی

کوردستان نەدابوو. واتە سیاسەتی ئێستاتی حکومەتی ناوەندیی بەغداش لە هەمان بازنەی داخراوی کۆندا دەخولێتەوە، کە بە شێوەیەکی فەرمی ڕێگە بە حکومەتی هەرێمی کوردستان نادات کە بۆ دەرهێنانی نەوتی هەرێم کێڵگەی نوێی نەوت لێبدات، وە بیانوشی بۆ ئەم بابەتە ئەوەیە کە ئەوکێڵگە ئەکتیڤە لێدراوانەی ئیراق توانایی وەدەرهێنانی نەوتی ئەم وڵاتەیان هەیەو پێویست بە لێدان و هەڵکەندنی کێڵگەی نوێ ناکات، واتە ئەمڕۆکەش دەیانەوێت بەهۆی سیاسەتێکی کلاسیکی شۆڤێنیەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای نەوتی بەدور بگرن.

هەربۆیەش پەرەپێدانی کێڵگە نەوتیەکانی نێو چوارچێوەی هەرێم شیاوترین وەڵامە بۆ گشت سیاسەتە چەوتەکانی گشت ڕژێمە شۆڤێنیە یەک لەدوای یەکەکانی نێو وڵاتی ئێراق. لە نەخشەی خوارەوەدا زۆربەی ئەوگشت دەڤەرانە دەستنیشانکراوە کە بە دڵنیایەکەی گەورە خاوەنی سەرچاوەکانی نەوت وگازی سروشتین. ئەم زانیاریە لە شارەزایەکی نێو وەزارەتی نەوتی ئێراقی وەرگیراوە.

دیارە بڕی گشتی کێڵکەکانی گشت کانزا هایدرۆکاربۆنەکانی نێو وڵاتی ئێرَاق بەهۆی نەبونی سیستمێکی نوێی ڕێکوپێکی ڕوپێووکردن (Exploration) لە سەرتاسەری ئێراقدا زۆر لەوە زیاترە کە لەم نەخشانەدا دەسنیشان کراوە. گشت هۆکارەکانی نەبونی تەکنۆلۆجیاو

کادیری شارەزا لەگەڵ گێژاوی سیاسی بەردەوام و شەڕی نێو وڵاتی ئێراق و شەڕی ئێراق لەگەڵ جیرانەکانی بەربەست بوون بۆ لێکۆڵینەوەی زایسزمیکی زانستیانە لەم وڵاتەدا.




نەخشەی ٣.٨: کۆمەڵە دەڤەرێکی خاوەن نەوتی نێو هەرێمی کوردستان




نەخشەی ٣.٩: کۆمەڵە دەڤەرێکی خاوەن نەوتی لە باشوری ئێراق




نەخشەی ٣.١٠: کۆمەڵە دەڤەرێکی خاوەن نەوتی لە ناوەڕاستی ئێراق




نەخشەی ٣.١١: کۆمەڵە دەڤەرێکی خاوەن نەوتی لە باکوری ئێراق

بە پێی سەرچاوەکانی نێو وەزارەتی نەوتی ئێراق تا ساڵی ٢٠٠٢ ئاوەها بڕی (ملیارد بەرمیلی) نەوتی زەخیرەی ئامادە بۆ بەرهەمی (٩٠% P) کۆمەڵێک کێڵگەی نێو وڵاتی ئێراق دەخرێتەڕوو:

Major Oil Fields (proven reserves - billion barrels):

Majnoon (12-30), West Qurna (11.3-15.0), East Baghdad (11+), Kirkuk (10+), Rumaila (10+), Bin Umar (6+), Rattawi (3.1), Halfaya (2.5-4.6), Nassiriya (2-2.6), Suba-Luhais (2.2), Tuba (1.5), Khurmala (1.0), Gharaf (1.0-1.1), Rafidain (0.7), Amara (0.5).

سەرەڕای ئەوەی کە ئێراق ١١هەمین وڵاتی جیهانی یە لە زەخیرەی گازی سروشتیدا بەڵام گرنگی گازی سروشتی لە ئێراقدا پێگەی نەوتی خاوی نی یە. کێڵگەکانی گازی سروشتی چەمچەماڵ، عین زالە، کەرکوک، عەکاس، المنصوریە و کۆرمۆر بەناوبانگترین کێڵگەی گازی سروشتی نێو وڵاتی ئێراقن. بەڵام زەخیرەی دۆزراوەی ئەم وڵاتە تا ساڵی ٢٠٠٢ (OPEC 2002) بەڕێژەی ٢% گشت زەخیرەی جیهانی لە خۆ گرتووە. یەکێک لە گرنگترین کێڵگەکانی گازی ئێراق لە ناوچەی کۆرمۆری کوردستاندایە کە ئەم کێڵگەیە لە ساڵی ١٩٩٠ وە گیشتۆتە قۆناغی بەرهەمهێنان.

بەهەمان شێوەش تەکنۆلۆجیای وەدەرهێنان و پەرەپێدانی گازی سروشتیش لە کوردستانی خۆماندا لە لایەن حکومەتی ناوەندیی ئێراقەوە پشتگوێ خراوە. هەر بۆیەش بوژاندنەوەی ئەم بوارەش یەکێکە لە ئەرکە نەتەوەییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە گشتی و وەزارەتی پەیوەندیدارە بەتایبەتی.

بەرنامەی کاری بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوتی هایدرۆکاربۆن لە هەرێمی کوردستاندا پێویستی بەم چوار خاڵەی خوارەوە هەیە:

١. هەبونی سامانی سروشتی هایدرۆکاربۆنات (نەوت وگاز) لە وڵاتدا.
٢. توانای تەکنیکی وەدەرهێنان و پاڵاوتن لە وڵاتدا.

٣. توانای گوێزانەوەی بەرهەمە هایدرۆکاربۆنیەکان پاش دەرهێنان و پاڵاوتن بۆ نێو بازارە جیهانیەکان.
٤. هەمواری چوارچێوەی رامیاری دور لەگەندەڵی و نەبونی بیرۆکراتی لەو وڵاتدا.

لە وێنەی خوارەوەدا گشت قۆناغەکانی گواستنەوە، پاڵاوتن و فرۆشتنی نەوتی خاو وەکو نمونە نیشان دراوە.




وێنەی ٣.١٢: قۆناغەکانی هەڵهێنجان، وەرگێڕان، پاڵاوتن و گواستنەوەی نەوتی خاو نیشاندراوە

ئەرکی نیشتیمانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەوەدایە کە سەرەتا چوارچێوەی کاری ئەو چوار خاڵەی سەرەوە لە نیو وڵاتدا سەقامگیر بکەن و پاشان بەهۆی

پسۆڕانی دەرەکیەوە تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتی بە شێوەیەکی ستانداردی جیهانی و بە بیرکردنەوە لە پارێزگاری ژینگە و چوستیەکی باش ببوژێننەوە و بۆ داهاتوش قۆتابیانی کورد بۆ ئەم بوارانە شارەزا بکەن.

تا ڕەخساندنی ئەو چوارچێوەیەی کە ئێمەش لە هەرێمی کوردستاندا بتوانین وەکو گشت ولاتانی پێشکەوتوی دی بەهۆی کۆمەڵێک شارەزای بواری وزە وە لە نێو کۆمیسیۆنی خولقاوی بالای وزە دا لەم چەند خاڵەی خوارەوە بکۆڵینەوەو پاشان بە هاوکاری پەڕلەمانی کوردستان چوارچێوەیەکی یاسایش بۆ بەرەوپێش بردنی وزەی کوردستان بۆ ئاینده دابرێژین. هەربۆیەش باشترە کە چوارچێوەی کاری ئەولێکۆڵینەوانە دا ئەم خالانەی خوارەوە ڕچاوبکرێن.

١. دیاریکردنی بڕی پێویستی وزە و چۆنێتی گەیاندن و دابەشکردنی بۆ گشت کونجو کەلە بەرێکی نیشتیمانی کوردستان،
٢. بەرنامەو پلانی گونجاو بۆ دۆزینەوە و دیاریکردن و هەڵبژاردنی وزەی گونجاوی ولات لەم ڕۆکەو دهاتوشدا،
٣. پلانی گونجاو بۆ لێکۆڵینەوە لە وزەو چۆنێتی گەیاندنی لە بەر ڕۆشنایی پاراستنی ژینگە لە کوردستاندا.

وەلامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە ئایا کوردستان خاوەنی چەند بەرمیل سامانی سروشتی هایدرۆکابۆنە کارێکی ئاسان نییە. ئەگەر بڕوانییە چۆنێتی خولقاوی جیولۆجی

خاکی کوردستان و گشت جیرانەکانمان ئەوا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە ئەگەری دۆزینەوەی سەرچاوە هایدرۆکاربۆنییەکان لەم دەقەرەی خۆماندا گەلێک گەورەیە. هەربۆیەش بۆ جوابانەوەی ئەو پرسیارە دەبێت چاوەڕوانی گشت زانیاریەکانی پاش کرداری ڕوپێووکردن بکەین. بۆ نمونە لەو نەخشەی خوارەوەدا زۆربەی ئەوکێڵگە ئاشکرایانەی نەوت و گازی سروشتی و ئەو ناوچانەی نێو هەرێمی کوردستان کە ئەگەری زۆری دۆزینەوەی نەوت و گازی سروشتیان لێیە نیشان دراوە.



نەخشەی ٣.١٣: پۆتێنسیالی سامانی سروشتی نەوت وگاز لە هەرێمی کوردستاندا

لەم بابەتەدا وەکو نمونە یەکێک لە کێڵگە نوێکانی نێو چوارچێوەی جوگرافیایی هەرێمی کوردستان دەخرێتە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێز. زانیاریە پێشکەش کراوەکان بۆ بەشداربوانی کۆمپانیاکەیە (Shareholders) کە لە ماڵپەڕی کۆمپانیای (Addax Petroleum) ئادەکس پیترۆلیۆمەوە لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ دا وەرگیراوە [13]. بە هۆی ئەم کۆمپانیایەوە دوو کێڵگەی تەق تەق و کێوی چەرمەڵە پەرەپێدەدرێت. هەرچەندە زانیاریەکان سەرەتایین، بەڵام دەتوانرێت بەوسەر ئەنجامە بگەین کە نەوتی هەرێمی کوردستان شایەنی ئەوەیە کە بۆ بەرژەوەندی سەراسەری ئێراق ببوژێتەوە.




نەخشەی ٣.١٤: نەخشەی ناوچەی تەق تەق و کێوی چەرمەڵە.

بەپێی سەرەتایترین زانیاریەکانی کۆمپانیای ئادەکس کێڵگەی تەق تەق خاوەنی توانای پاشەکەوتکراوی نزیکەی ٣ ملیارد بەرمیل نەوتی خاوە. بە پێی زانیاری تیمی ڕوپێوکردن کە لە وێنەی خوارەوەدا دەسنیشانکراوە کێڵگەی تەق تەق و توانای بیرەکانی بەم شێوەیەیە. ئەم نەوتە یەکێکە لە نەوتە سوکە باشەکانی جیهان چونکە خاوەنی (API: ٤٧ American Petroleum Institute).




نەخشەی ٣.١٥: کێلگەی تەق تەق و توانای بیرەنەوتەکانی

لەو نەخشەیەی سەرەوەدا کێڵگەکە بەگشتی و ئەو گشت بیرە نەوتانەی کە تا ئەو کاتە لێدراون دیاریکراوە. کەواتە

توانای بەرهەمهێنانی گشت بیرەکانی T1 تا T7 تەنهالە ئەم کێڵگەیەدا لە سەرو ١٠٠ هەزار بەرمیل نەوتی خاوە لە ڕۆژێکدا.

بەهەمان شێوەش وەکو نمونەیەکی تری نەوتی نێو خاکی هەرێمی کوردستان لە لایەن کۆمپانیای د.ن.ئۆ. (DNO) ی نەرویجیەوە، کە لە دەڤەری زاخۆ کاردەکات، کۆمەڵە زانیاریەک لە بەرواری ١٨.١٢.٢٠٠٧ لە بارەی کێڵگەی نەوتی تاوکی زاخۆ (Tawke) لە ماڵپەڕەکەیاندا بڵاوکراوەتەوە [14].



وێنەی ٣.١٦: دیمەنی تاوەرێکی نێو کێڵگەی نەوتی تاوک لە ناوچەی زاخۆ

نەوتی ئەم کێڵگەیە تا ڕادەیەک سەنگینە، چونکە چڕیەکەی لە نێوان ( API: ٢٥ تا ٢٧ (American Petroleum Institute)دایە. ئەم کێڵگەیە خاوەنی نزیکەی ٢ ملیارد بەرمیل نەوتی خاوە و لە ڕوبەرێکی (25 KM X 3 KM) دایە. توانای ئەو ٩ بیرەی کە لە نێو ئەم کێڵگەیەدا لێدراوە دەگاتە نزیکەی ٩٠٠٠٠ هەزار بەرمیل لە ڕۆژێکدا.

١. بەڵام ئایا کێ سەربەرشتی کاری ئەم کۆمپانیایانە دەکات؟

چونکە سامانی سروشتی نەوت وگازی سروشتی پەیوەندیەکی لێکنەپچڕاوی بەگشت کۆمەڵامی خەڵکی کوردوستانەوە هەیە و چوارچێوەیی دارشتنی گشت بوارەکانی سیاسی و ئابوری و تەنانەت کۆمەڵایەتیش لەم ڕۆکەو لە ئایندەدا بەهۆی ئەوەوە دادەڕێژرێت. هەروەها نەوتیش لە بەر گرنگی لە بواری ئابوریی و گێڕانەوی سەرمایە بۆ وڵات لە ڕابوردوشدا جەمسەری سەرکی گشت شۆڕشە چەکداریەکانی کوردستان دژی دەستەڵاتدانی ناوەندی بەغداد بوە لە سەرتای خوڵقاندنی وڵاتی ئێراقەوە تا ئەمڕۆ.

٢. ئایا سیاسەتی ئایندەی هایدرۆکاربۆنی لە هەرێمی کوردستاندا کێی دایدەڕێژێ؟

٣- ئایا زانیاری هەڵکەندی بیرەنەوتیەکان بەروکوێ دەچن، ئایا وەزارەتی پەیوەندیدار ئەرشیفی نەوت وگازی سروشتی هەیە بۆ نەوکانی داهاتو.؟

وەکو نمونەیەکی ساکار لە کاتی لێدان یاخود هەڵکەندنی هەر بیرێکی هایدرۆکاربۆنی لە وڵاتدا دەبێت لێکدانەوی کۆڕی (Core-Drilling) بۆ بکرێت.




وێنە ٣.١٧: زانیاری کۆڕی جیۆلۆجی

وە ئەم زانیاریانە کە لە وێنەکەی سەرەوەدا هاتوە پاش لێکۆڵینەوە لە سەنتەرێکدا لە لایەن پسپۆڕانەوە بۆ لێکدانەوەی چونێتی خولقاندنی زەوی وڵات هەڵدەگیرێت.

لە ئاینەدەیەکی نزیکدا بە لێکدانەوی سەرئەنجامی کاری پراکتیکی حکومەت وەڵامی ئەو گشت برسیارانەی سەرەوە لەلایەن حکومەتی ئیراق و هەرێمی کوردستانەوە دەدرێتەوە. گرنگی پێدانی ستراتیجیەتی نەوت لەلایەن گشت تاکێکی وڵاتی ئێراق و هەرێمی کوردستانەوە لەوەو سەرچاوەی گرتووە کە تا داهاتویەکی دوریش هەربەهۆی نەوت و گازی سروشتیەوە دابینکەری پارەی بژێویی و سەرمایەی پێویستی وڵات و داینەمۆی پیشەسازی دەبێت.

## ٣.١ گرنگی ئەمڕۆی وڵاتی ئێراق لە نێو ئۆرگانی ئۆپێکدا

لە نەخشەی خوارەوەدا وڵاتی ئێراق و سەرچاوەکانی کۆنی نەوتی و خاو گازی سروشتی خراوەتە ڕوو. بە پێی بڕی سامانی سەرچاوە سروشتییەکانی ئێراق یەکێکە لە وڵاتە پڕ نەوتەکانی نێو ئۆرگانی ئۆپێک.




نەخشەی ٣.١٨: وڵاتی ئێراق و گشت گێڵگەو ئەو ڕێگانەی کە نەوت و گازی لێدەبرێتە دەرەوە.

نەوتی خاو و گازی سروشتی تا ئەمڕۆش سەرەکیترین وزەی سەرەتایین لە نێو جیهاندا. هیچ کانزایەکی سروشتی ناتوانێت جێگەی ئەم وزانە چ لەبواری پیترۆکیمیاوی و چ لە بواری وزە بۆ نێو ئامێرەکانی گواستنەوەدا بگرێتەوە، هەر بۆیەش گشت تەکنۆلۆجیا بە گشت بوارەکانیەوە لە سەراسەری دونیادا بەم وزانە پابەندن. لە بواری وزەوەرگێڕاندا ٨٠% گشت وزەی جیهان بەنەوتی خاوەوە بەندە و لە بواری هێزی نێو ئامێرەکانی گواستنەوە بە ڕێژەی ٩٧% بە وزەی پلە دوو واتا بە بەنزین و کیرۆزینەوە بەندە کە ئەمانەش چەند بەرهەمێکی سەرەکی نێو پاڵاوگەکانی نەوتی خاون.

لە وێنەی خوارەوەدا لۆگۆی گرنگترین ئۆرگانی جیهانی وزە دەستنیشان کراوە، کە ئەویش ئۆرگانی ئۆپێکە. لە نێو ئەم ئۆرگانەدا وڵاتی ئێراق بنیاتنەر سەرەکیترین ڕۆڵی هەیە.




وێنەی ٣.١٩: ئارمی ئۆرگانی ئۆپێک

بەکورتی مێژووی ئۆرگانی ئۆپێک لەوەوە دەستپێدەکات کە لە ساڵی ١٩٦٠ دا بوو کە ئەم ئۆرگانی ئۆپێکە لەنێوان پێنج ئەندامە زلهێزە بەرهەمهێنەرەکەی نەوتی خاو وەکو عەرەبستانی سعودی، ئێراق، ئێران، فینۆزوێلا، کوێت، لە سەر پێشنیاری وەزیری نەوتی وڵاتی فینۆزوێلا لە شاری بەغداد دامەزرا. سەرەتا خۆماڵی کردنی نەوتی ئێران لە لایەن د. مصدق لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٠ و کودەتای قاسم لە ساڵی ١٩٥٨ لە ئێراق کە هەردووکیان هەوڵی سەرکەوتوانەی کەمکردنەوەی کاریگەری سیاسەتی ئیستعماری بەریتانیان لە ئێران و ئێراق دا، بەتایبەتی لە بواری قۆرغکردنی سامانی نەوت، هۆکاری سەرکی خولقێنەری ئۆرگانی ئۆپێک بوون.

ئێستا ئۆرگانی ئۆپێک لە ١٢ وڵات پێکدێت، کە زۆربەیان وڵاتە ئیسلامیەکانن و ئەو وڵاتانەش بە پێی نەخشەی خوارەوە کەوتونەتە بەشی خواروی گۆی زەوی، چونکە بەشی سەروی گۆی زەوی جگە لە ڕوسیا خاوەنی خەڵوزی بەردینی زۆرترە.



وێنەی ٣.٢٠: ئەو وڵاتانەی کە ئۆرگانی ئۆپێک پێکدێنن

سەرەتا بەهۆی کێشەی زۆری نێو ئەو وڵاتانەی سەرەوە، شارەزایانی بواری وزەی دونیا تەمەنی ئۆرگانەکەیان بە کورتخایەن دەخەمڵاند، بەڵام سەرەڕای گشت کێشەکانی نێوان وڵاتەکانی خوڵقێنەر تا ڕادەیەک ئەم ئۆرگانە لە پیادەکرنی بەرنامەکانیدا سەرکەوتوو بوو. وڵاتی ئێراق لەبەر ئەوەی کە نزیکەی ١٢% گشت زەخیرەی نەوتی جیهانی لە خۆگرتووە، یەکێکە لە سەرەکیترین ئەندام و بونیادنەری ئەم ئۆرگانە.

چوارچێوەی کاری ئەم ئۆرگانە لەسەرتادا خۆی لەم چەندخاڵانەی خوارەوەدا دەبینیەوە.

١. یەک دەنگی و هەماهەنگی سیاسەتی وزە و ئابوری لە نێو گشت ئەندامەکانی ئۆرگانەکەدا.
٢. بە نەگۆر هێشتنەوەی نرخی نەوتی خاو لە بازارەکانی جیهاندا.
٣. دیاریکردنی بڕی نەگۆڕی ناردنەدەرەوەی ڕۆژانەی نەوتی خاو لە نێو گشت ئەندامەکانی ئۆرگانەکەدا بۆ سەقامگیرکردنی بازاڕی ئابوری نەوتی جیهان.

لە کۆبونەوە نوێکەیاندا لە ساڵی ٢٠٠٨ لە عەرەبستانی سعودی ئەم دوخاڵەش خرایە نێو ئەجێندای گفتوگۆکانی نێو ئۆرگانی ئۆپێک:

٤. پارێزگاری لە ژینگە و سەرمایەگوزاری بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی پیسبونی ژینگە بەهۆی قۆناغەکانی وەرگێڕانی وزە لە کانزافۆسیلیەکانەوە
٥. پارێزگاری لە یەکسانی کۆمەڵایەتی لە نێو وڵاتانی ئەندامدا.

پاش ئەوەی ئەم ئۆرگانە دەستی بە ڕاپەڕاندنی گشت کارەکانی خۆی کرد، گشت وڵاتەکانیَ دی نێو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هاتنە ڕیزی ئەم ئۆرگانەوە، کە تائێستا ژمارەی گشت ئەندامەکانی بە ١٢ ئەندام گەیشتون. گشت ئەندامەکانی لەم وڵاتانەی خوارەوە کە بریتین لە،

جەزائیر، ئەنگۆلا، ئێران، ئێراق، کوەیت، لیبیا، نێجیریا، قەتەر، سعودی عەرەبی، ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو، ئیکوادۆر و ڤینۆزوێلا پێکهاتون. ئەم ئۆرگانە لە شاری ڤێنا ئۆفیسی سەرەکی خۆی هەیە.

لەمساڵانەدا وڵاتەکانی ئەندۆنوسیا و ئیکوادۆر و گابوون بەهۆی دابەزینی بڕی سامانە سروشتیەکانیان خۆیان لەم ئۆرگانە کێشایەوە.

گرنگترین هەنگاوی ئەم ئۆرگانە لەسەرەتاوە بەشداری وڵاتی ئێراق کشانەوەی تەکنۆلۆجیای پەرەپێدانی نەوت بوو لە دەست کۆمپانیا زلهێزەکانی نەوت لە وڵاتەکانیاندا، وە پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای بەداواگەڕان و دەرهێنانی تەکنۆلۆجیای نەوت بەهۆی کادیرەشارەزاکانی وڵاتەکانیان و خستنە ژێر ڕکێفی گشت بوارەکانی نەوت. لە ساڵەکانی سەرەتای خولقاندی ئەم ئۆرگانە تا ١٩٧٠ لە وەدەرنان و کشانەوەی گشت کۆمپانیا زلهێزەکان لە نێو وڵاتەکانیان سەرکەوتوو بوون. بەڵام وڵاتەکانی ئۆرگانی ئۆپێک نەیانتوانی نرخێکی شیاو بۆ نەوتی خاو لە نێو بازاڕەکانی دونیادا بدۆزنەوە.

یەکێک لە سەرکەوتوترین بەرهەمە سیاسیە ئابوریەکانی نێو ئۆرگانی ئۆپێک بە بەشداری وڵاتی ئێراق لە ساڵی ١٩٧٣ دا خولقاندنی قەیرانی وزە بوو، کە بۆ جارێکی تر لە وزە وەکو چەکێکی سیاسی بۆ سەپاندنی گشت مەرامە

سیاسیەکان سودی لێوەرگیرا.

کەواتە مەرامی ئەم ئۆرگانە لە ساڵی ١٩٧٣ وە بۆ گشت وڵاتە پیشەسازیەکانی وابەستە بەنەوتیخاو ڕونبووەوە کە ئەویش بە چەککردنی وزە بوو لە دونیادا.

هەر بەهۆی ئەنجامی ئەم بڕیارەوە بوو کە توانرا نرخی بەرمیلێک لە نزیکەی ٣ دۆلارەوە بەرەو نزیکەی ٢٠ دۆلار بەرن. دەوری محمد رەزا شای ئێران بە چاولێگەری قەزافی لە وڵاتی لیبیا لە بەرەو سەر بردنی چوار قاتی نرخی نەوتی خاو لەو ماوەیەدا زۆر ئاشکرا بوو. بەڵام لە بەر ناکۆکی نێوان ئەندامەکانی ئۆپێک نەتوانرا لە ساڵەکانی ١٩٨٠ وە تا ٢٠٠٠ نرخێکی نەگۆڕ بۆ نەوت دابینبکرێت.

بەڵام لە پاش ساڵەکانی ٢٠٠٠ وە بەشێوەیەکی نەگۆڕ نرخی نەوتی خاو بەرەو سەرێ هەڵکشا و تا خۆی لە ١٠٠ دۆلار نزیک کردەوە، لە کۆتای ساڵی ٢٠٠٧ دا نرخی بەرمیلێک نەوتی خاو خۆی لە ١٠٠ دۆلار نزیککردەوە و بە نەگۆڕی لە نێوان ٩٠ تا ١٠٠ دۆلاردا بۆ هەر بەرمیلێک مایەوە.

هۆکارەکانی ئەم بەربونەوەیەی نەوتی خاویش دەگەڕێتەوە بۆ:

١. ناسەقامگیری باری ئالۆزی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

٢. هەڵکشانی باری ئابوری وڵاتانی چین، بەڕازیل و هیندستان و وابەستەیی تەکنۆلۆجیای ئەوان بەنەوتی خاو.
٣. کەمبونەوەی زەخیرە نەوتیەکانی وڵاتی ئەمریکا.
٤. بەرەو کەمبونەوەی زەخیرەی ژێرزەوی وڵاتانی خاوەن نەوت و دیاردەی (Peak Oil) بە هۆی لە بڕهاتوی ئەم کانزا سەرەتاییە.
٥. ناسەقامگیری نرخی دراوی دۆلار لە بازاڕەکانی جیهاندا، چونکە کڕین و فرۆشتنی نەوتی خاو بە دراوی دۆلاری ئەمریکی دەکرێت.

لە نوێترین ڕاگەیاندنی ( International Energy Agency: IEA) ئاژانسی وزەی نێودەوڵەتی کە لە CNN لە مارسی ٢٠٠٨ بڵاوکرایەوە لە زاری پسپۆڕی بواری نەوت د. فاتیە بیڕۆڵ ( Dr. Fatih Birol) دا هاتووە, کە ئەو نەوتەی لەژێرزەویدا ماوە بەشی پێداویستییەکانی جیهان ناکات و بەرەو تەوابون دەچێت.

بە پێی ئەم ئاماژەیە کە لە CNN دا هاتووەوە ئاوەها شیدەکرێتەوە: ئەم کەمبوونەوەیەش بە ٤٠٠ کێڵگەی نەوتەوە لەسەرانسەری جیهاندا دیارە، کە لەلایەن هەمان ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێت.

لەو ڕاگەیاندنەدا لە زاری پسپۆڕی بواری نەوت فاتیە بیڕۆڵ دا هاتوە کە کەمبونەوەتی گێڵگە نەوتیەکان لە جیهاندا کاریگەرییەکی دیاری لەسەر بازارەکانی نەوت دەبێت کە هەر لەئێستاوە نرخی بەرمیلێك نەوت خۆی لە ١٣٥ دۆلار داوەو ئەمەش بەرزترین نرخە تائێستا پێی گەیشتبێ. کەمبوونەوەی نەوت لەبازاڕەکانی جیهاندا بە مانای بەرزبوونەوەی خێرای نرخی شتومەکە، هەر لە بەنزینەوە بگرە تا خۆراك و جلوبەرگ. بەگوێرەی مەزەندەی ئەو ئاژانسە، جیهان لە ساڵی ٢٠٣٠ دا ڕۆژانە پێویستی بە ١١٦ ملیۆن بەرمیل نەوت دەبێت لەکاتێکدا ئێستا پێویستی بە ٨٧ ملیۆن بەرمیل هەیە لە ڕۆژێکدا [١٨].

هەروەها د. فاتیە بیڕۆڵ لە بەرواری ٢٧.٠٦.٢٠٠٧ لە ڕۆژنامەی لیمۆندی فەرەنسی ("Le Monde") ئامارژە بەوەدەکات کە ئەگەر دەرهێنانی نەوتی ئێراق تا ساڵی ٢٠١٥ بە شێوەیەکی ئەندازیاری ئێکسپۆنێنشیاڵ (Exponential) بەرەوسەرێ هەڵنەگەڕی، ئەوا جیهانی پیشەسازی توشی گەورەترین گرفت دەبێت. چونکە بۆ دابینکردنی ئەو بڕە پێویستیەی نەوتی جیهان کە لە ڕۆژێکدا دەسوتێت، کە ئەگەر وڵاتی عەرەبسیانی سعودیش ڕێژەی دەرهێنانی نەوتی خۆی بەرزبکاتەوە، ئەوا هەربەش ناکات [١٨].

هەروەها بە تێڕوانینی ئەمڕۆی جیهان بەهۆی هەڵکشانی باری ئابوری وڵاتەکانی چین، هیندستان و بەڕازیل، لە پاڵ

ئەمەریکاو ژاپۆن پێویستە بڕێکی زیاتری نەوت بخرێتە نێو بازارەکانی جیهانەوە. لە هێڵکاری ٣.١٩ دا ڕێژەی داهاتی ناوخۆی ساڵانە (Gross Domestic Product) بۆ کۆمەڵە وڵاتێک خراوەتە ڕوو. هەروەکو دەبینرێت وڵاتانی چین و هیندسان و بەڕازیل بە خێراییەکی مەزن لە گەشەسەندن دان.

لەو هێڵکاریەی خوارەوەدا ڕونکراوەتەوە کە گەشەی ئابوری وڵاتانی چین و هیندستان لە پلەی سێهەم و چوارهەمی گشت دونیا دایە.




هێڵکاری ٣.٢١: گەشەی ئابوری چەند وڵاتێکی مەزنی جیهان [٢١]

وڵاتانی نێو ئوپێک بە گشتی و وڵاتانی عەرەبستانی سعودی و ئێران بەتایبەتی لە بڕی ئەمڕۆی دیاری کراوی

نەوت بۆیان زیاتر توانای دەرهێنانی نەوتێکی چەند ملیۆنی زیادەی تریان نییە.

هەروەکو چۆن لە هێڵکاری ٣.٢١ دا بڕی نەوتی بەرهەمهاتو لە وڵاتی عەرەبستانی سعودیەوە ڕونکراوەتەوە. لەم هێڵکاریەداش مەزەندەی ئەوە دەکرێت کە لە ئایندەدا ئەم وڵاتە توانای بردنەسەرەوی ڕێژەی نەوتی ڕۆژانەی خۆی نەبێت.




هێڵکاری ٣.٢٢: بڕی نەوتی بەرهەمهاتوی ڕۆژنە لە وڵاتی عەرەبستانی سعودی

چونکە دەرهێنانی بڕی زیاتر پێویستی بە تەکنۆلۆجیای زۆرتر و پۆتێنسیالی مرۆڤی زیاتر هەیە، کە زۆربەی

وڵاتەکانی نێو ئۆرگانی ئۆپێک بە ئاستی هەرە بەرزی توانایان گەیشتون، واتە داواکاری زێدەتر لە توانای تەکنۆلۆجیا و ئیدارەی ئەواندا نەماوە. بەڕاشکاوی زۆربەی ئەم وڵاتانەی سەرەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سیاسەتی دەرهێنیانی بڕێکی زیاتر لەو ڕێژەیەی کە لەلایەن ئۆرگانی ئۆپێکەوە بۆیان دیاریکراوە ناگرنەبەر.

بەڵام وڵاتی ئێراق کە ئێستا بڕی ٢،٢ ملێون بەرمیل نەوت دەنێرێتە نێو بازارەکانی دونیاوە، تاکە وڵاتە کە بتوانێت بڕی ناردنەدەرەوەی نەوتی خۆی بۆ تا ٧ ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا بەرەو سەرێ بەریت. واتە ئەم وڵاتە بە هەرێمی کوردستانەوە توانای مرۆڤی و پۆتێنسیالی زەخیرەیی ڕێگەی پێدەدات کە بڕی ناردنەدەرەوەی ڕۆژانەی خۆی چەند بەرابەر لێبکات. هەر بۆیەش چاوی گشت وڵاتە پیشەسازیەکان بڕاوەتە وڵاتی ئێراق.

سەرەڕای ئەمانە هێنانە دی ئەم ئارەزوە لە سەرەتادا پێویستی بە سەقامگیری باری ئابوری و ئاسایشی وڵات هەیە و پاشان پێوستی بە پەرەپێدان و مۆدێرنیزەکردنی تەکنۆلۆجیای بەدواگەڕان (Exploration) و دەرهێنان (Production) و گوێزانەوەی نەوت (Transportation) هەیە. وە بەرەو سەربردنی بڕی دەرهێنانی ساڵانەی نەوت پاش سەرمایەگوزاریەکی گەورە کاتێک دێتە ئاراوە کە گشت کێڵگە نەوتیەکان دووبارە مۆدێرن بکرێنەوە.

هەروەکو چۆن لە هێڵکاری خوارەوەدا هاتووە، لە نێو گشت وڵاتانی خاوەن سامانە هایدرۆکاربۆنییەکان بە تەنها وڵاتانی نێو ئۆرگانی ئۆپێک پاش سەرمایەگوزاریەکی مەزن بە هۆی بڕی زۆری زەخیرەی هایدرۆکاربۆنی لە وڵاتەکانیایندا توانیای زیادکردنی بڕی ناردنەدەرەوی نەوتی خۆیان هەیە لە ئایندەدا [١٩].

## World Oil Production




*OPEC countries – mainly in Middle East – will account for almost all the increase in world oil production to 2030*

هێڵکاری ٣.٢٣: بڕی بەرهەمهێنانی نەوت لە جیهاندا تا ساڵی ٢٠٣٠

لە نێو ئەم هاوکێشە ئاڵۆزەی وزەشدا هەرێمی کوردستان ئەگەر گشت سەرچاوەی سامانە سروشتییەکان لە ژێر ڕکێفی خۆیدابێت ئەوا گرنگترین پێگەی ڕامیاری وەردەگرێت لە نێو

وڵاتی عێراقدا، چونکە لەلایەکەوە باری ئاسایشی ئەم دەڤەرە لە چاو ناوچەکانی تری نێو وڵاتی ئێراق سەقامگیرترە، لە لایەکی ترەوە خاوەنی زەخیرەیەکی بێشوماری نەوت و توانای مرۆڤیشی باشە.

حکومەتی هەرێمی کوردستان دەرکی بەو ڕاستییە کردوە و ئامادەیە ڕۆڵی شیاوی خۆی بگێڕێت. چونکە لە سیاسەتی ڕاستی حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە کە تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتی ببوژێنرێتەوە. هەواڵی توانای ناردنەدەرەوەی یەک ملیۆن بەرمیل نەوت لەڕۆژێکدا لە حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە گەورەترین کارتی ڕامیاری ئابوری وزەیە بۆ ئایندەی ئەم دەڤەرەو جیرانەکانمان. چونکە ئەو تەکنۆلۆجیایەی کە ماوەی سەد ساڵە لە لایەن گشت حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی ناوەندیی لە کۆمەڵانی خەڵک لە هەرێمی کوردستان حەرام کراوە، ئەمڕۆ لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانە وە دەبوژێنرێتەوە.

ئەوی لامان ئاشکرایە، ڕژێمی سەدام بەهۆی سیاسەتی شەڕئەنگێزی دژ بە دراوسێکانی و سیاسەتی دوور لە دیمۆکراسی لە ناوخۆدا ڕێگربوو لە بوژاندنەوی تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز لە وڵاتەکەیدا، کە واتە ئەتوانرێ بوترێ کە بەهۆی نەمانی ئەم ڕژێمە توتالیتاریە ڕەگەزپەرستە، ڕێگە بۆ بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتی چ بۆ کۆمپانیاکانی ناوخۆ و چ بۆ کۆمپانیاکانی بیانی دەرەوە لە گشت کونج و کەلەبەرێکی

ئەم وڵاتە، چ لە باکو، چ لە باشور ئاوەڵابوو (وێنەی ٣.٢٣). چونکە تەکنۆلۆجیا بەگشتی و بواری بوژاندنەوەی نەوت وگازی سروشتی بەتایبەتی لە وڵاتی ئیراق و بە تایبەتی لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستانی خۆماندا لە سەرەتای هاتنەکایەی ڕژێمی بەعسی فاشی بەدەست سیاسەتی ڕەگەزپەرەستانە و شەڕئەنگێزی سەرکردکانیەوە دەی ناڵاند.

لە وێنەی خوارەوەدا (٣.٢٣) ڕوخانی ڕژێمی سەدام و بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت بە شێوەیەکی کاریکاتێر دەستنیشان کراوە.




وێنەی ٣.٢٤: ڕوخانی ڕژێمی سەدام و بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت

لێرەدا پاش ئاماژەپێکردن بە دیاردەی ترۆپی دەرهێنان و ماوەی سودلێوەرگرتنی نەوتی خاو دێنینە پێش چاو، واتە (Peak Oil). هەروەکو چۆن لە هێڵکاری ۳.۲۳ و هاوکێشەی خوارەودا ۳.۱ دیاریکراوە، زەخیرەی و توانای دەرهێنانی زۆربەی وڵاتانی جیهانی گەیشتۆتە ترۆپی خۆی و ئیتر بەرەو خوارەوە دەچێت.

واتە چاڵە نەوتیەکانیان لە خاڵی بونەوەدان، بەڵام نەوتی چاڵەکانی هەرێمی کوردستان لە بەردەستلێنەداروی هێشتابە پڕی ماونەتەوە. لە هاوکێشەی خوارەوەدا E.3.1 بەردەوامی سودلێوەرگرتنی زەخیرەی سامانەسروشتییەکان شێدەکرێتەوە.

Lifetime = Resource / Annual Consumption

**What is wrong with this calculation?**

لە هەر وڵاتێکدا زەخیەری سامانە سروشتییەکان (Resources) لە بڕهاتووە، وەهەروەها بە پێی گەشەی ئابوری و دانیشتوانی نێو کۆمەڵگاش بڕی سودلێوەرگرتنی ئەو وزانە ساڵ لە داوی ساڵ بەرەو سەرێ هەڵدەکشێت، هەر بۆیەش ماوەی بەردەوامی سودلێوەرگرتنی ئەو سەرچاوانە (Lifetime) دادەبەزێت، واتە سامانە سروشتییەکان بەرەو تەوا بوون و نەمان دەچن. ئاووها دەتوانرێت دیادەی ترۆپی بەرهەمهێنان (Peak Production) دیاری بکرێت.




هێڵکاری ٣.٢٥: بەراوردی بڕی زەخیرەی نەوتی
وڵاتی خۆمان و گشت جیهان

هەر بۆیەش ئەگەر وڵاتی ئێراق بیەوێت پێگەی خۆی لە نێو گشت وڵاتانی ئۆپێک دا بسەپێنێت، دەبێت لە هەرێمی کوردستانەوە هەوڵی بوژاندنەوە و مۆدێرنزەکردنی تەکنۆلۆجیای نەوت بدات تا لە چەند ساڵێکی داهاتودا لەم دەڤەرەوە چەند ملیۆن بەرمیل نەوت ئاڕاستەی بازاڕەکانی دەرەوە بکرێت.

جێگەی باسە کە تا ئەمڕۆ بەهۆی سیاسەتی چەوتی شۆڤێنیانەی ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی مەرکەزیەوە لە بەغدا ڕێگە لە پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتی لە هەرێمی کوردستاندا گیراوە. کەواتە کاتی ئەوە هاتوە کە ئەم سیاسەتە کلاسیکیە دۆڕاوە وەلا بنرێت و ڕێگە

بە هەرێمی کوردستانیش بدرێت هەروەک شارەکانی تری ئێراق لە بواری بەرەوپێشبردن و بە پیشەسازیکردنی وڵاتی ئێراقی فیدرال هاوکاربێت.

بەگشتی نرخی نەوتی خاویش لە ١٣٠ دۆلارەوە هەردەم بەرەو سەرێ هەڵدەکشیت، ئەگەر ئێمە بەراوردی نرخی بەرهە پیترۆکیمیاویەکان و باجی دانراوی سەر بەرهەمەکانی نەوت وگازی سروشتی لە نێو وڵاتە پیشەسازیەکان بکەین بەو سەرئەنجامە دەگەین کە بڕی ١٥٠ دۆلایش بۆ هەر بەرمیلێک نەوتی خاو هەر هەرزانە.

بە لێکدانەوەی دانیشتنەکانی ئەم دواییەی گەورەبەرپرسانی وڵاتەکانی ئۆپێک لە مانگی نۆڤەمبەری ٢٠٠٧ لە پایتەختی عەرەبستانی سعودی (ڕیاز) بەو سەرئەنجامە دەگەین کە کاری نەوت وەکو چەکی وزە تەنها لە نێو دەستی وڵاتەکانی دەرهێنەر و خاوەنی نەوتی خاوە. هەر بۆیەش سەرۆکی وڵاتی فینۆزوێلا، هۆگۆ چاڤێس، هەڕەشە دەکات، کە ئەگەر ئەمەریکا هێرش بکاتە سەر دەوڵەتەکەی و وڵاتی ئێران ئەوا نرخی نەوت دەگەیەننە ٢٠٠ دۆلار بۆ هەر بەرمیلێک.

بەهەمان شێوەش احمدی نژاد، سەرۆک کۆماری وڵاتی ئێران دەیەوێت کە نەوت بە بارودۆخی ڕامیاری وڵاتەکەیەوە لەگەڵ گشت وڵاتە پیشەسازیەکانی جیهانەوە ببەستێتەوە. هەڕەشەکانی ئێران لەوەوە سەرچاوە دەگرێت

کە نزیکەی ٦٥% گشت نەوتی بەکارهاتوی ڕۆژانەی گشت جیهان لە تەنگەی هۆرمزەوە تێپەڕدەبێت و لەلای چاودێرانی سەربازیش ئاشکرایە کە تەنگەی هۆرمز بەهۆی درێژی سنوری ئێران بە کەنداوی فارسیەوە لە ژێر ڕکێفی سەربازی وڵاتی ئێراندایە.

ئەم لێدوانانە، ڕونکردنەوانە و هۆکاری سیاسی لە پشت گرانی و کەمبونەوەی نەوتی خاوەوەن لە بازاڕەکانی جیهاندا.




هێڵکاری ٣.٢٦: هەوڵەکانی ئێران و فینۆنزوێلا بۆ گرانی و کەمبونەوەی نەوت

## ٤. نرخی نەوتیخاو و کارتێکەری لە سەر ئاوەدانی کوردستان



وێنەی ٤.١: وێنەی ئامێرەکانی هەڵهێنجانی نەوتی خاو

لەم بابەتەدا لە پێگەی سیاسی وڵاتی ئێراق چوارچێوەی کاری ئۆرگانی ئۆپێک و لە هەمانکاتیشدا لە گۆڕانکاری لە هۆکارەکانی هەڵکشانی نرخی نەوتی خاو لە ماوەی نزیکەی دە ساڵێکدا دەکۆڵرێتەوە.

لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی کە لە ساڵی ١٩٢٠ کە بەریتانیا کۆنترۆڵی ئێراقی گرتەدەست و لە ١٩٢١ دا بە فەرمی مەلیک فەیسەڵ کوڕی شەریفی مەکە کرا بە پاشای ئەو وڵاتە. هەبونی نەوتێکی زۆر لەم وڵاتەدا یەکێک بوو لەو هۆکارانەی کە وڵاتی بەریتانیای هێنایەسەر ئەو بیرۆکەیەی

کە هەر سێ ویلایەتەکانی موسڵ و بەغداد و بەسرە بەیەکەوە بلکێنێت و لە ناوچەی میزۆپۆتامیادا وڵاتی ئێراق بخوڵقێنێت. تا ئەمڕۆکەش نە خوڵقاندنی وڵاتی ئێراق و نە خاوەنداریێتی نەوتەکەی بونەتە سیمبۆلی ئاشتی و ئاسایش بۆ ئەو وڵاتە بەگشتی.

بەتایبەتی کوردستانی خۆشمان لە بەر بیرۆکەی شۆڤێنی داگیرکاری ڕۆژلەداوی ڕۆژ لە چوارچێوەی ئەم یەکگرتنە خۆنەویستەشدا کاولکراوە و ژێرخانی ئابوریەکەی شێوێندراوە.

بەڵام هەروەک لە بەشەکانی ڕابوردودا ئاماژەی پێکرا، وڵاتی ئێراق یەکێکە بوو لە وڵاتە ئەکتیفەکانی خوڵقاندنی ئۆرگانە ئۆپێک. لە ڕۆژی ١٠ تا ١٤.٠٩.١٩٦٠ لە بەغداد گرێبەستی ئەم ئۆرگانە لە نێوان نوێنەرەکانی وڵاتانی ئێران، کویت، سعودی عەرەبی، ڤینوزوێلا واژووکرا. پاشان وڵاتەکانی ئیماراتی عەرەبی، لیبیا، جەزایر و وڵاتەکانی تر هاتنە نێو ئۆرگانەکەوە. ئەم ئۆرگانە تا ڕادەیەک توانی هەروەکو چۆن لە بەشەکانی ڕابوردودا لە پاش کۆمەڵە گرفێکی زۆر نرخی نەوت بەهۆی هەڵکشان و داکشانی بڕی ناردەنەدەرەوەی نەوتی خاو بۆ نێو بازاڕەکانی دونیا سەقامگیر بکات. دیارە کۆمەڵە هۆکارێکی دیاریکراوی تری سیاسی و ئابوری بۆنە هۆی هەڵکشان و داکشانی نرخی نەوتی خاویش لە بازاڕەکانی دونیا دا. ئاوەها بەپێی ئەم

خاڵانەی خوارەوە لەم چەند ساڵە دا نرخی نەوت لە بازارەکانی دونیا جێگیر بوو.

تا ساڵەکانی ١٩٧٣ ئۆرگانی ئۆپێک بە زۆر گرفتی ترەوە ئاوقە بوو بوو، بۆیە نەیتوانی لە بەرزکردنەوە و جێگیرکردنی نرخی نەوتی خاو شتێک بەدی بهێنێت. لەدوای ساڵەکانی ١٩٧٣ و ١٩٧٩ کە نەوت وەکو چەکێکی ڕامیاری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پاش شەڕی عەرەبەکان وئیسرائیل، شۆڕشی کۆماری ئیسلامی ئێران و پاشان شەڕی ئێراق و ئێران سودی لێوەگیرا، نرخی نەوت لە ٢ دۆلارەوە بەرەوە سەرێ هەڵکشا، ئەو بابەتە بۆ وڵاتە پیشەسازیەکان ئاشکرا بوو کە چۆن گشت تەکنۆلۆجیاکەیان بەم وزەسەرەتاییانەوە پابەندن و بەهۆی ئەم کانزا فۆسیلیانەوە توشی قەیرانی وزە و ئابوری دەبن، حاشاهەڵنەگرە کە ئەم کانزایە بەتێکڕا هێزی بازوی گشت وڵاتە پیشەسازیەکانە.

هەر چۆن لە وێنەی ٤.٢ دا نیشاندراوە، بەرهەمەکانی نەوتی خاو پاش کرداری پاڵاوتن لە بواری هێزی مەکینەکانی گواستنەوە بە بێ ڕەقیبن لە دونیادا.



وێنە ٤.٢: گرنگی نەوتی خاو بۆ ئامێرەکانی گواستنەوە و زلهێزی دونیا ئەمەریکا

ساڵی ١٩٩٨ دا نرخی نەوتی خاو لە بازاڕەکانی دونیا دا لە کەمترین نرخی خۆیدا بوو. لەم ساڵەدا ناکۆکیەکی بێئەندازە لە نێوان گشت ئەندامانی ئۆرگانی ئۆپێک دا هەبوو. لە کۆتایەکانی ساڵی ١٩٩٨ دا نرخی نەوتی خاو گەیشتە نزمترین ئاست و کە هەربەرمیلێک بە دەوری $ ١٠ دۆلار لە بازاڕەکانی ڕۆتەردامدا لە هۆڵەندا دەفرۆشرا.

ساڵی ١٩٩٩ دا بارودۆخی بازاڕی نەوت جارێکی دی گۆڕا. وڵاتانی نێو ئۆپێک توانیان لە یەکتر نزیکببنەوە خۆیان ڕێکبخەن و بڕی ناردنەدەرەوەی نەوتی خاوی نێو وڵاتەکانیان کەم بکەنەوە تا نرخی هەر بەرمیلێک لە نێوان $ ٢٢ تا $ ٢٨ دۆلار بەسەر گشت بازاڕەکانی جیهاندا بسەپێنن. وڵاتانی نێو ئۆپێک بە دیسپلینێکی باشەوە بڕی دیاریکراوی خۆیان بە بێ زیادەڕەویی دەناردە نێو بازاڕەکانی دەرەوە تا ئەم هەڵوێستە بوە هۆی هەڵگەڕانی نرخی بەرمیلێک نەوتی خاو لە $ ١٠ دۆلارەوە بۆ $ ٢٠ دۆلار.

ساڵی ٢٠٠٠ دا وڵاتانی نێو ئۆپێک بڕی ناردنەدەرەوەی نەوتی خۆیان چوار قات بردەسەرەوە و بڕی ڕۆژانەی ٢٩.٥ ملیۆن بەرمیل نەوتیان خستە بازاڕەکانی جیهانەوە. باشتربونی ئاستی ئابوری نێو وڵاتە پیشەسازیەکان بووە هۆی بەرەو سەربردنی نرخی نەوت لە بازاڕەکاندا. پاش ئەوی چەندجارێک نرخی نەوت لە ٣٥ دۆلار بۆ هەر بەرمیلێک سەرکەوت، بەڵام نرخی مامناوەندی نەوت لە

نێوان ٣٠ دۆلار دا مایەوە. بەڵام لە کۆتایی ساڵدا نرخی نەوت جارێکی دی دابەزی.

ساڵی ٢٠٠١ دا وڵاتانی نێو ئۆپێک توانیان نرخی نەوت تا مانگی نۆ لە نێوان $ ٢٢ تا $ ٢٨ دۆلاردا بهێڵنەوە. چەند جارێک بڕی ناردنەدەرەوەی نەوتی خۆیان بە ڕێژەی ١٣% کەمکردەوە بەڵام لە هەمانکاتیشدا وڵاتانی ڕوسیای کۆن بڕی ناردنەدەرەوەی نەوتی خۆیان بۆ ٩% بەرزدەکردەوە. کرداره تیرۆریستیەکەی ١١.٠٩.٢٠٠١ کارێکی خراپی کردەسەر گشت بارودۆخی ئابوری دونیا و کەمبونەوەی پێداویستی نەوت بۆ پیشەسازی پاشان وڵاتانی ئۆپێک توانیان بە هەماهەنگی لەگەڵ وڵاتانی ڕوسیا و نەرویج و مەکسیک نرخی بەرمیلێک لە $ ١٧ دۆلاردا بهێڵنەوە.

لەساڵی ٢٠٠٢ دا بەهۆی باشتر بونی باری ئابوری گشت جیهان توانرا نرخێکی نەگۆڕ بۆ هەر بەرمیلێک نەوت دابینبکرێت و شەڕی نێوان ئێراق و ئەمریکا بوە هۆی هێشتنەوەی نرخی نەوت لە نێوان $ ٢٢ تا $ ٢٨ دۆلار.

لە ساڵی ٢٠٠٣ دا هۆکاری شەڕی ئێراق و ئەمریکا کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر بازارەکانی نەوت هەبوو تا ئەوەی نرخی نەوت بەرەو سەرێ هەڵکشا. تا ئەوکاتەی کە بڕی پاشەکەوتی نەوت لە چاڵەکانی ئەمریکا دابەزی و نرخی بەرمیلێک بۆ سەرو تر لە $ ٢٨ دۆلار هەڵکشا.

لە ساڵی ٢٠٠٤ دا ئێراق بەهۆی ئاژاوەکانی دوای شەڕەوە توانایی ناردنەدەرەوەی نەوتی نەبوو و وەگشت چاڵەزەخیرەکراوەکانی نەوتی ئەمریکاش بەرەوە کەمبونەوە دەچون تا ئەو کاتەی نرخی نەوت گەیشە $ ٤٠ دۆلار بۆ هەر بەرمیلێک.

لە ساڵی ٢٠٠٥ دا ئیتر ڕۆژگاری هەرزانی نەوتیخاو بەیەکجارەکی لە چاڵ نرا. کارەساتە کانی تۆفانی کاترینا لە ئەمریکا و مکزیک کە زیانی بە کۆمەڵە کێڵگەیەکی هەڵهێنجانی نەوت و پلاتفۆڕمەکانی هەڵهێنجانی نەوتی دەریا گەیاند، بوە هۆی گرانبونی نەوتی خاو لە گشت بازاڕەکاندا.

لە ساڵی ٢٠٠٦ دا سەرەڕای ئەوەی کە گشت وڵاتەکانی ئۆپێک بە ئاخر توانای خۆیان نەوتیان دەناردە نێو بازاڕەکانی جیهانەوە بەڵام نرخی نەوتی خاو گەیشتە $ ٥٥ دۆلار بۆ هەر بەرمیلێک. ئەگەر تۆفانی تر وەکو کاترینا لە ئەمریکا بەردەوام بوایە و کێشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هاڵۆزتربوایە و ئێرانیش لەو کێشانەدا بگلایە ئەوا نرخی هەر بەرمیلێک نەوتی خاو بۆ $ ١٠٠ دۆلار مەزندە دەکرا.




وێنەی ٤.٣: هەڵکشانی نرخی نەوت لە وڵاتدا [7]

لە ساڵی ٢٠٠٧ دا کە بە پێی ئەو مەزندەی گشت پسپۆڕانی بواری وزە، نرخی هەر بەرمیلێک لە نیوان ٦٠ تا 80 دۆلاردا دەمێنێتەوە، ئەم پیشبینیە ڕاستدەرچوو وە تەنانەت لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٧ دا نرخی نەوتی خاو خۆی لە ١٠٠ دۆلار نزیک کردەوە و لە نێوان ٩٠ تا ١٠٠ دۆلاردا جێگیر بوو.

لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٨ دا نرخی نەوتی خاو لە ١٠٠ دۆلار بۆهەر بەرمیلێک جێگێر بوو وە تامانگی مارسیش (May 2008) لە نێوان ١٣٥ دۆلاردا ماوەتەوە. بە پێی مەزەندەی زۆربەی شارەزایانی بواری نەوت لە ساڵی ٢٠٠٨

دا نرخی بەرمیلێک نەوت خۆی لە ١٥٠ دۆلار نزیک دەکاتەوە.

لە ساڵەکانی ٢٠٠٩ و ٢٠١٠ دا نرخی نەوت لە نێوان $ ٧٠ تا $ ٩٠ دۆلار بە جێگیری مایەوە.

نرخی گازی سروشتیش کە بۆ هەر هەزار پێ سێجا m ft3 ($١٠-٨) دۆلارە، بەهەمان شێوە لە ژێر کاریگەری نرخی نەوتی خاو دایەو و هەردەم شانبەشانی نەوتی خاو لە هەڵکشاندایە. لەم بابەتەدا ئاماژە بە گرنگی گازی سروشتی ناکرێت، بەڵام حاشا هەڵنەگرە کە پێگەی ئەم وزە سەرەتاییە لە نێو تەکنۆلۆجیای وڵاتە پیشەسازیەکان بەگشتی و بۆ وەرگێرانی وزەی کارەبا بەتایبەتی هەردەم گرنگتر دەبێت و لە داهاتوشدا جێگەی نەوتی خاو لە زۆر بواری وەرگێڕانی وزە و پیترۆکیمیاویدا دەگرێتەوە بەڵام کارتێکەری ڕامیاری و ئابوری لە سەری وەکو نەوتی خاو وایە.

کەواتە ئیستا بەرزی نرخی نەوتی خاو دیاردەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ نێو وڵاتانی پیشەسازی. تا ئەمڕۆش هیچ وزەیەکی دی نیە هاوشێوەی نەوت کە بەو شێوەیە وزەیەکی زۆری تێدا کۆکرابێتەوە و لە بواری گواستنەوەدا ئاوەها هەرزان و بەسود بێت. کەواتە لە داهاتوشدا لە بەر هۆکاری گەشە سەندنی توانای ئابوری وڵاتانی چین و هیندستان و بەڕازیل و کەمبونەوەی نەوتی خاو لە نێو چاڵەکانی

زۆربەی وڵاتانی خاوەن نەوت هەر بەرەو سەرێ هەڵدەکشێ و نرخی ١٥٠ $ دۆلاریش بۆ هەر بەرمیلێک هەر هەرزانە.

دیارە لەلایەکەوە وڵاتە پیشەسازیەکان بەهۆی سودوەرگرتن لە وزەنوێیوەکان و وزەی ئەتۆمی و بردنەسەرەوەی نرخی کەرەسە تەکنیکیەکانیان و فرۆشتنی توانای تەکنۆلۆجیان بە نرخێکی زۆر دەتوانن تا ڕادەیەک هەڵکشانی نرخی نەوت و کاریگەری لە سەر باری ئابوری وڵاتەکانیان دامرکێنن، لەلایەکی دیەوە ئەو وڵاتە دواکەوتوانەی کە نە خاوەنی ئەم کانزاسەرەتایانەن و نە توانای تەکنۆلۆجیای بەهێزیان هەیە، تاکە دۆڕاوی ئەم هاوکێشە ڕامیاریە ئابوریانەی وزەن.

وڵاتانی خاوەن نەوت و گازی سروشتیش دەتوانن بە هۆی فرۆشتنی ئەم کانزایانەوە ژێرخانی ئابوری خۆیان ئاوەها سەقامگیر بکەن تا ئەو کاتەی نەمانی نەوتیخاو لە نێو هاوکێشە ئابوریەکان گرفتی سەرەکیان بۆ دروست نەکات. ولاتەکانی نێو ئیماراتی عەرەبی هەنگاو بۆ سەپاندنی ئەم بابەتە دەنێن و تا ڕادەیەکیش بە پێی بیروڕای زۆربەی ئابوری ناسانی جیهانی سەرکەتون، چونکە وابەستەیی ئابوری ئەمڕۆی ئەم میرنشینانە بەگشتی و بەتایبەتی دوبەی بە سامانی فرۆشراوی نەوتی خاو لە ١٠% کەمترە.

لێرەدا لە نێو چوارچێوەی وڵاتی ئێراق سەرنجی هەرێمی کوردستان دەدەین. لە هیچ گۆشەو شوێنێکی ئەم دونیایەدا

(جگە لە چاڵە نەوتەکانی چواردەوری کەرکوکی) هاشێوەی چاڵە نەوت و گازەکانی هەرێمی کوردستان بەدی ناکرێت، کە ئاوەها زەخیرەکانی بەپڕی مابێتەوە. ئاوەها کێڵگە بڕ گازی سروشتی و نەوتی خاوی چاوەڕوانی سەرمایەدارانی دەرەکی و ناوەکی بکەن.

بۆ نمونە هەزارەها بیری گازی سروشتی وڵاتی ئەمریکا (تەکزاز) توانای بەرهەمهێنانی چەند بیرێکی گازی ئەم هەرێمەی خۆمانی نییە. بەڕاشکاوی هەرێمی کوردستان تاکە دەڤەری کراوەی نێو ئەم جیهانەیە کە تا ئەمڕۆکە هیچ ڕوپێووکردنییێکی زانستییانەی زایزمیکی ( particularly seismic) بۆنەکراوە، بۆیە پێویستە بە زوترین کات لەلایەن خودی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بە سەرپەرشتی وەزارەتی پەیوەندیدار و کۆمپانیا بیانیەکان ڕوپێووکردنی پشکنینێکی زایزمیکی بەهۆی هێنانەناوەی پسپۆڕانی بواری گیۆفیزیایی بۆ بکرێت تا پۆتێنسایالی وزەی هایدرۆکاربۆنی نەوت و گازی سروشتی ئەم هەرێمە ڕونبکرێتەوە.

کەواتە کاتی ئەوە هاتووە کە بەهۆی سیاسەتی ڕاستی حکومەتی هەرێمی کوردستان سود لەم زەخیرە نیشتیمانیانە وەربگرێن و ژێرخانی ئابوری وڵاتمان وەکو وڵاتانی ئیمارەتی عەرەبی ئاوەها سەقامگیر بکەین کە لە داهاتوادا نەمانی ئەم کانزایانە هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆی لەسەر ئابوری وڵاتمان نەبێت.

کەواتە بەهۆی ئەم وزە سەرەتاییانەوە کارێک بکەین کە چوارچێوە و توانای ئابوری وڵاتمان بەرهەمی بیرو هۆشی هاوڵاتیانمان ببەستینەوە نەک وەکو زۆربەی وڵاتانی خاوەن نەوت بەس چاوەڕوانی بەرهەمی ئەم کانزایانە بکەین. واتە بەرهەمەکانی نەوت وگاز بخەینە گەر بۆ گەشەسەندنی بیر و توانای هاوڵاتیانی کوردستان نەک بۆ خوڵقاندنی دیاردەی تەمەڵی و ڕێگە لەو بگیرێت کە ئیعتیمادی گشت وڵات و هاوڵاتیان لەسەر ئەم کانزاسەرەتایانە بێت.

بەهۆی لێکدانەوەکانی سەرەوە و تینوی تەکنۆلۆجیای نێو وڵاتە پیشەسازیەکان و لەبڕ هاتویی کانزا فۆسیلیەکان و نەوبونی هیچ ئەڵتەرناتیڤێکی دی کە لە بواری وزەدا جێگەی ئەم کانزا فۆسیلیانە بگرێتەوە ئەو بابەتە بەڵگە نەویستانەن کە بونەتە هۆی ئەوەی کە نەوتی خاو و گازی سروشتی ئاوەها بەگرانی بمێننەوە و ئەم گرانیەش لە نێو بازاڕەکانی دونیا دا و بڕی زۆری نەوت و گازی سروشتی و بەردەوامی زەخیرەی ئەم کانزا سەرەتایەکان تا چەند سەدساڵیکی دی لە هەرێمی کوردستاندا و لە هەمانکاتیشدا دڵنیای لە سیاسەتی ڕاست لە ڕاستای دابینکردنی ئاوەدانی و ئاسایش بۆ هاوڵاتیان باشترین هەلی ڕەخساوەن بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەمان و ئایندەڕونی ئەم گەلە ستەملێکراوەمان لە داهاتودا.

## ٤.١ لیترێک نەوتیخاو لە دوورگەی عەرەبیەوە تا بازاڕی ئەڵمانیا




وێنەی ٤.٤: نەوتی خاو لە بیرێکەوە بۆ نێو وێستگەی دابشکردنی بەنزین

لەم بابەتەدا هەوڵی شیکردنەوەی ئابوریانەی ڕێچکەی لیترێک نەوت پاش هەڵهێنجانی لە یەکێک لە کێڵگە نەوتەکانی نێو وڵاتانی کەنداوی فارسەوە تا نێو شاری کۆلنی ئەڵمانیا دەدرێت (وێنەی ٤.٤). پاش لێکدانەوەی و شیکردنەوەی ئەم بابەتە بۆمان ڕون دەبێتەوە کە چۆن بەهۆی دارشتنی ڕامیاریەکی بەئاگاو لە ڕاستای

داخوازیـەکانی کۆمـەڵانی خـەڵک بەڕێوبەرایـەتی وڵات لـە ئەڵمانیا بە شێوەیەکی هوشیارانە پراکتیزە دەکرێت.

ئەگەر هەر مرۆڤێک لە سەراسەری دونیادا بیر لە نەوتی خاو بکاتەوە ڕاستەوخۆ وێنەی عەرەبێکی عەگال بەسەر لە تەنیشت حوشترێک و لە نێو بیابانێکدا کە خاوەنی کۆمەڵە کۆشکێکە دێتە پێش چاوی.

واتە هەرئەوانن کە خاوەنی بیرەکانی نەوتیخاون و گشت قازانجی نەوتیش هەر بۆ گیرفانی ئەوانە.

بەڵام لە ڕاستیدا هەریەک لە حکومەتە پیشەسازییەکان بەگشتی و وڵاتە ئەوروپیەکان بەتایبەتی بە هۆی سیستەمی باجەکەیانەوە بە زێدەتر لە دەیان جار لە بەرابەر وڵاتەکانی خاوەن نەوتی خاوی نێو کەنداوی فارس لە قازانجی کڕین و فرۆشتنی نەوتیخاو سودمەندن. واتە ئەم وڵاتە پیشەسازیانە توانیویانە بەهۆی بیرۆکەیەکی ئابوری ڕاست لە بەرهەمی ئەو کانزایە بخۆن کە خۆیان خاوەنی نین.

بەڕاشکاوی لێرەدا بۆ گشتمان ئاشکرادەبێت کە بەرهەمی بیری مرۆڤ گەلێک بەسودترە لە بەرهەمی کانزاکانی نێو وڵات، چونکە ئەو کانزایانە هەیشەیی نین، بەڵام بەرهەمی بیری مرۆڤ هەردەم لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی لە نوێبونەوەدا یە.

نرخی هەڵهێنجانی هەر بەرمیلێک نەوت لە وڵاتەکانی نێو کەنداوی فارس (بۆ نموونە: کویت) نزیکەی ١ $ واتە هەر بەرمیلێک کە ١٥٩ لیترە و نرخی لیترەکەی خۆمان دەکاتە ٠.٦٢ سنت. پاش بارکردنی لە یەکێک لە تەنکەرە قەبە گەورەکان کە نزیکەی ٣٠٠.٠٠٠ تەن دەگرێت و کرداری بارکردن ٣٦ ڕۆژ دەخایەنێت کە دواى دەبێت ڕێچکەی بەرەو کەناڵی سویس بگرێت. یەکڕاستە نرخی ئەم لیترەی خۆمان ٦٤ قات زیاد دەکات واتە ئێستا ٤٠.٣ سنت بۆ هەر لیترێک.



وێنەی ٤.٥: تەنکەرێکی مەزنی بۆ گوێزنەوەی نەوتی خاو

بۆ دەرباز بوونی ئەم تەنکەرە قەبەیە لە کەناڵی سویسەوە لە بەرهۆی نزمی ئاوی نێو کەناڵەکە پێویستە ئەم تەنکەرە سەرەتا خاڵی بکرێتەوە و پاشانیش پڕ بکرێتەوە

چونکە تەنکەرەکە بە بڕی ٢٥ مەتر دەچێنە نێو دەریاکەوە بەنێو کەناڵەکەدا ڕەتنابێت. لە پاش خاڵیکردنەوەی نەوتەکە بە بۆری دەگوازرێتەوە و لەو سەری کەناڵەکەوە دەکرێتەوە نێو تەنکەرەکەوە و ئاوەها ئەم تەنکەرە زەبەلاحانە لەو کەناڵەوە ڕەتدەبن.




وێنە ٤.٦: ڕێچکەی لیترە نەوتەکە تا نێو ئۆتۆمۆبیلەکان

نرخی ڕەتبوونی تەنکەرەکە لە کەناڵی سویسدا: ٣٠٥٠٠٠ $ (وەرگیراو لە fairkehr)

کرێی ڕۆژانەی ئەم تەنکەرە: ٢٠٠٠٠ $ واتە تا گەیشتنی بە بەندەری ڕۆتەردامی هۆڵەندا دەگاتە بڕی نیو ملیۆن دولار.

نرخی سوتەمەنی بۆ ماوەی ٢٥ ڕۆژ تا گەیشتنی بە بەندەری ڕۆتەردام: ٦٠٠.٠٠٠ $

کرێی بەندەری ڕۆتەردام: ١٣٠.٠٠٠ $

کە کۆی گشتیان دەکاتە نزیکەی ١.٥٣ $ ملیۆن دولار.

کەواتە نرخی ٠.٧ سنت دەچێتە سەر هەرلیترێک، کە کۆی گشتی دەکاتە نزیکەی ٤١ سنت بۆ هەر لیترێک پاش گەیشتنی بۆ نێو بەندەرەکە لە کەنارەکانی وڵاتی هۆڵەندا. ئیدی لە بەندەری ڕۆتەردامەوە دەتوانرێت بەهۆی بۆری نەوتەوە بگەیەنرێتە گشت پاڵاوگەکانی نێو وڵاتانی بەلجیکا، ئەڵمانیا و هۆڵەندا.



وێنە ٤.٧: ڕێچکەی لیترە نەوتەکە تا گوێزانەوەی بۆ نێو پاڵاوگەکان

نرخی ئەم گواستنەوەیە بە هۆی بۆری نەوتەوە بۆ نێو پاڵاوگەکانی نێو شاری کۆلن دەکاتە ٠.٠٠٧ سنت بۆ هەر لیترێک. سەرئەنجامِ لیترە نەوتەخاوەکەی ئێمە پاش بەسەر بردنی چوار ڕۆژ لە نێو بۆریەکاندا (Pipelines) دەگاتە نێو یەکێک لە پاڵاوگەکانی نێو شاری کۆلن. نرخی ئەم گوێزانەوەیە نزیکەی ٥ $ دولار بۆ هەر تەنێک نەوتیخاوە. کە پاش گەیشتنی بۆ نێو پاڵاوگەکە نزخی ٥١ سنت وەردەگرێت.

لەم پاڵاوگەیە مۆدێرنەدا ڕۆژانە ١٦ ملیۆن تەن نەوتی خاو بۆ کۆمەڵە بەرهەمێکی جیاواز دەپاڵێورێت (تکایە بڕوانە وێنەی ٤.٨). ڕوبەری پاڵاوگەکە km2 ٢ کیلۆمەتر دووجایە و تەنها بەهۆی ٦٤ کارمەندی شارەزاوە بەڕێوە دەچێت. لە وێنەی ٤.٨ دا نمونەی یەکێک لە و پاڵاوگە مۆدێرنانە دێتە پێش چاومان.



وێنەی ٤.٨: پاڵاوگەایەکی مۆدێرنی پاڵاوتنی نەوت

پاش تێپەڕاندنی کاری پاڵاوتن ئێستا لیترە نەوتەکەی ئێمە بووە بە بەنزین و لە هەریەک لە وێستگەکانی بەنزینخاکانی شاردا دەتوانرێت سودی لێوەربگیرێت. بەڵام بە شێوەیەکی ئەفسانە ئاسا و لە پڕێ نرخی لیترە بەنزینەکە بە نرخی نزیکەی ١٧٠ سنت دەفرۆشرێت. لە وێنەی خوارەوەدا ٤.٩ دا گشتنبەرهەمە گرنگەکانی نەوتی خاو پاش پاڵاوتن لە نێو پاڵاوگەکاندا دەستنیشان کراوە.




وێنی ٤.٩: بەرهەمەکانی یەک بەرمیل نەوتی خاو
لە پاش کرداری پاڵاوتن

کەواتە هەروەکو چۆن لە دایەگەامی خوارەوەدا ٤.٨ نیشان دراوە بەس لە لایەن حکومەتی ئەڵمانیاوە ٧٥ % نرخەکەی بە ناوی باجەوە بەرەو سەرێ براوە و ٦ % بۆ گواستنەوە، پاڵاوتن (لەو لیترە نەوتەدا تەنها یەک لەسەر پێنجی نرخەکەی تەرخان دەکرێت بۆ کاری پاڵاوتن) و

ئـــەنبارکردن تـــەرخانکراوە وە تـــەنها ١٩ % نرخـــی کڕینـــی نەوتەکەیە. بەهۆی ئەم بەراوردەوە جیاوازی گـەوریی نێوان نرخی کڕینی نەوتەکەو نرخی فرۆشتنەوەی ئاشکرا دەبێت.




دایەگرام ٤.١٠: هەڵسەنگاندنی نرخی لیترێک نەوتیخاو پاش فرۆشتنی وەکی بەنزین

## ٥. بڕیار بۆ گرێبەستە هایدرۆکاربۆنیەکان و شیکردنەوەیان

ئەگەر حکومەتی ناوەندی ئێراق دەست لە سیاسەتی بایکۆتی ڕێگەنەدان بە بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت وگازی سروشتی لە کوردستان هەڵنەگرێت، ئەوا بۆ بوژاندنەوەی ئەو تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتییە لە هەرێمی کوردستاندا پێویستیمان بە تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوی سەردەم، سەرمایەیەکی زۆری دەرەکی و کۆمەڵە کادیرێکی شارەزای بیانی هەیە، وە بۆ گەیشتن بەم سێ خاڵە گرنگە، کە لە هەرێمەکەماندا نی یە، پێویستیمان بە هێنانەناوەی کۆمپانیا بیانیەکانە، کە ئەم پەیوەندیەش لە ژێر ناوی گرێبەستە هایدرۆکاربۆنیەکاندا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام پرۆسەی هەڵبژاردنی جۆری گرێبەستەکە گرنگترین هەنگاوە کە کارتێکەری لە سەر دواڕۆژی ئەم تەکنۆلۆجیایەو باری ئابوری وڵات دەبێت.

چونکە ئەگەر ئێمە خۆمان ئەم تەکنۆلۆجیایە بە بودجەی وڵات ببوژێنینەوە ئەوا لە سەرەتادا هەردۆلارێک کە ئێمە لەو بوارەدا خەرجی دەکەین لە هەمانکاتیشدا ئێمە دۆلارێکمان لە بودجەی وڵات بۆ ڕاپەڕاندنی پرۆژەکانی تر کەم کردۆتەوە. بەڵام ئەگەر سەرمایەدارانی دەرەکی و شارەزایانی خۆیان هاتن ئەوا هەر دۆلارێک کە ئەوان بۆ بوژاندنەوەی ئەم تەکنۆلۆجیایە لە بواری نەوت و گاز لە

کوردستاندا خەرجی دەکەن لە هەمانکاتیشدا دوو دۆلار بە سەرمای گشتی وڵات زیاد بووە. بۆیە هێنانەناوەی سەرمایەی دەرەکی و گوێزانەوەی شارەزایی و تەکنۆلۆجیای پێشکەوتو لە بواری نەوت و گازدا لەم قۆناغەدا بیرۆکەیەکی سەرکەوتو دەبێت. بەڵام گرنگ ئەویە ئەو کۆمپانیایانەی کە بەشداری لە بوژاندنەوەی ئەو تەکنۆلۆجیایەدا دەکەن خاوەنی سەرمایەیەکی مەزن و ڕابوردویەکی تەکنیکی درێژخایەن بن نەک کۆمپانیایەک کە لە هیچ شوێنێک پێناسەی نەبێت و بێ ئابڕوی پیشەسازی لە بواری نەوت وگازدا بێت (no name company).

سەرەتا دەبێت حکومەتی بەرپرسیار چوارچێوەیەکی کاری بۆ کۆمپانیا هایدرۆکاربۆنییەکان لە ژێر ناوی گرێبەستی نەوتی گەڵالە کردبێت تا کۆمپانیاکان بەهۆی بەفەرمی ناسینی ئەو چوارچێوە یاساییە یاخود لە ژێر ناوی ئەو گرێبەستەدا ئامادەی کاری خۆیان لە وڵاتدا نیشان بدەن.

لە هێڵکاری خوارەودا ٥.١ چۆنێتی گەیشتن بە گرێبەستە نەوتییەکان لە هەر حکومەتێکی تەندروستی شەفاف دا ڕونکراوەتەوە. سەرەتا داواکاریەکان بۆ گەیشتن بە گرێبەستەکان پێشکەش بە حکومەتی خۆجێی دەکرێن و پاشان لە لایەن لیژنەیەکی ڕاسپێدراو هەڵدەستن بە جیاکردنەوە و هەڵسەنگاندنیان و لە دوا قۆناغدا بڕیار بۆ یەکێک لەو داواکاریانە دەدرێت. شارەزای و پێشینەی کار

لە بواری نەوت وگازی سروشتیدا و توانای دارایی و مرۆڤی گرنگترین فاکتۆری هەڵبژاردنی ئەو کۆمپانیایەن.




هێڵکاری ٥.١: چونێتی لێکوڵینەوە و گەیشتن بە گرێبەستە هایدرۆکاربۆنییەکان [٢٠]

لەو کۆبونەوەی هەڵسەنگاننەدا دەبێت کۆمپانیاکان بیسەلمێنن کە لەسەر ڕەوتی سیاسەتی نەوت وگازی وڵات دەڕۆن و ئارەزو و توانای تەکنیکیی بوژاندنەوەی ئەو تەکنۆلۆجیایەیان لە وڵاتدا هەیە. پاشان لە قۆناغێکی تردا لە لایەن حکومەتی بەرپرسیارەوە دانوستان لەسەر کات و چۆنێتی کار و چوارچێوەی ئابوری بۆ کاری داواکارو دەکرێت.

هەرچۆن لە سەرەتادا ڕونکرایەوە دەبێت حکومەتی بەرپرسیار چوارچێوەیەکی کاری بۆ کۆمپانیاکان دابینکردبێت. هەربۆیەش بۆ ڕونکردنەوەی زیاتر لە هێڵکاری خوارەوەدا بە شیوەیەکی گشتی پۆلێنکردنی چوارچێوەی گرێبەستەکان لە بواری نەوت و گاز لە دونیای ئەمڕۆدا دەستنیشان کراون. ئەم گەرێبەستانە لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێن. بەشی (Concessionary System) دا واتە هەردوولا چ حکومەتی خۆجیی و چ کۆمپانیای بەرهەمهێنەری سامانە سروشتیەکان لە سەرەتادا لە سەر بۆژاندنەوەی کێڵگەکان ڕێکدەکەون.

واتە لایەنی دووەم ئەو ئمتیازەی پێدەدرێت گشت ئەرکەکانی دۆزینەوە، بوژاندنەوە و هەڵهێنجانی بەرهەمە هایدۆکاربۆنیەکان بەهۆی سودوەرگرتن لە وێستگەکانی بوژاندنەوی بەرهەمەکانەوە (Facilities) دەگرێتە ئەستۆی و پاشان پاش فرۆشتنی و گێرانەوەی گشت خەرجیەکان قازانج لە نێوانیاندا دەبەش دەکرێت.

ئەم گرێبەستانە لە سەرەتای دۆزینەوەی نەوت لە وڵاتاندا بەگشتی و لە ئەمریکا بەتایبەتی تا ساڵەکانی ١٩٠٠ وە پاشان لە وڵاتی ئێراندا سودی لێوەردەگیرا. تا ڕادەیەک ئەم گرێبەساتانە مۆرکی داگیرکاری و بە تاڵانبردنی سامانە سروشتییەکانی زۆربەی گەلانی بەکۆڵۆنی کراویان پێوەدیاربوو، هەربۆیەش ئەم

جۆرەگرێبەستانە پاش هەڵکردنی باهۆزی ئازادی گەلان لە نێو چوون.




هێڵکاری ٥.٢: چۆنتی پۆلێنکردنی گشت گرێبەستەکان لە دونیای نەوت وگازدا [١٥]

بەڵام گرێبەستی جۆری دووەمی واتە ( Contractual System) تا ڕادەیەک هەردەم لە دونیای نەوت وگازی سروشتیدا لە پەرەپێدان و نوێکردنەوەدان. بەڵام لە هەردوو لقی گرێبەستەکاندا خاوەندارێتی سەرکی گشت سامانە سروشتییەکان بۆ حکومەتی خۆجێی دەگەڕێتەوە.

بە پێی بیروڕای زۆربەی پسپۆڕانی بواری نەوت بۆ ئەو ناوچانەی کە سامانە سروشتییەکانی ئاشکرایەو یاخود چەند بیرێکی لێدراوە، ئەتوانرێت سود لە گرێبەستی خزمەتگوزاری بۆ بوژاندنەوەی کێڵگەکان وەربگیردرێت. چونکە ئەو ناوچانەی کە لە ڕابوردودا نەوتی لێدۆزراوەتەوە

هیچ ڕسکێکی کاری بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە سروشتییەکانی تێدا نییە. لە خشتەی خوارەوادا بە شێوەیەکی ساکار جیاوازی نیوان گرێبەستی خاوەندارێتی ئمتیاز و گرێبەستی دابەشکردنی داهات ڕونکراوەتەوە.

## خشتەی ٥.١: جیاوازی نێوان گرێبەستی دابەشکردنی داهات و گرێبەستی ئیمتیاز

| گرێبەستی دابەشکردنی داهات Contractual System | گرێبەستی ئیمتاز Concessionary System |
| --- | --- |
| حکومەتی خۆجێی خاوەنی گشت ئامێرو وێستگەکانە | کۆمپانیاکە خاوەنی گشت ئامێرو وێستگەکانە |
| لە کاتی ناردنەدەرەوی بەرهەمەکان گشت قازانج دابەشدەکرێت At export Point | لە دەرهێنانی بەرهەمەکاندا گشت قازانج دابەشدەکرێت At wellhead |
| بە شێوەیەکی بەردەوام لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی خۆجێی دایە | بە شێوەیەکی زۆر کەم لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی خۆجێی دایە |
| حکومەتی خۆجێی بڕیاری هەڵبژاردنی وێستگە تەکنۆلۆجیەکان دەدات | کۆمپانیاکە بڕیاری هەڵبژاردنی وێستگە تەکنۆلۆجیەکان دەدات |

هەرچەندە زۆربەی نەوتی سوکی دیاری هەرزان بەرهەمهاتوی نێو جیهان تایبەتمەندیەکانی ئەم گرێبەستانەی دابەشکردنی بەرهەم (Contractual System)

نایان گرێتەوە. چونکە ئەم گرێبەستانە بۆ ئەو ناوچانە دەبن کە لایەنی ڕیسکی (ئەمان) دۆزینەوەی بەرهەمە هایدرۆکاربۆنیەکان گەورەبێت و تاڕادەیەک سەرچاوەکان دورەدەست و دۆزینەوەی نەوت لەو شوێنانەدا زۆر دشوار و پێویستی بە تەکنۆلۆجیای پیشکەوتو بێت.

یەکێک لەو گرێبەستە کلاسیکیانەی دابەشکردن کە لەبواری نەوت وگازی سروشتیدا سودی لێوەردەگیرێت تا ئەمڕۆش هەربەردەوامە، گرێبەستی دابەشکردنی داهاتە (PSA: Production Sharing Agreements). سەرەتا (PSA) بە واتای گرێبەستی دابەشکردنی داهاتی هایدرۆکاربۆنی دێت. بەهۆی ئەم گرێبەستەوە حکومەتی خۆجێی واز لە حەقی دەرهێنان و بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای هایدرۆکاربۆنیەکان دەهێنێت و دەیخاتە ئیختیاری یەکێک لە کۆمپانیاکانی ترەوە. بەهۆی ئەم گرێبەستەوە کۆمپانیایەکی دەرەکی یاخود سەرمایەگوزارێکی دەرەکی هاوکاری حکومەتی خۆجێی دەکات بۆ بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز لە ناوچەیەکی دیاریکراوی وڵاتدا بە بێ ئەوی ئەو کۆمپانیا هەڵبژێردراوە لە سەرەتادا داوای هیچ کرێیەکی ئەنجامدانی ئەو کارە ڕاستەوخۆ لە حکومەتەکەوە وەربگیردرێت.

لە سەرەتادا هەردوو لایەنەکە لە سەر ئەوە ڕێکەدەکەون کە گشت خەرجیەکانی کاری دۆزینەوە (ڕوپێووکردن)، دەرهێنان و پەرەپێدانی کێڵگە هایدرۆکاربۆنەکان لە

بەرهەمی چاوەڕوانکراوی فرۆشراوی دۆزراوە بدرێتەوە. واتە کۆمپانیای وازۆکەری گرێبەستەکە ئەگەر لە ئەنجامی کاری ڕوپێووکردن و بیرلێداندا بە هیچ بەرهەمێک نەگەیشت ئەوا ناتوانێت داوای بڕی سەرمایەی تێچو بۆ کارەکەی لە حکومەتی خۆجێی بکاتەوە، کە ئەمەش بە بێئەمان یاخود ڕسکی (Risk) کاری گرێبەستی دابەشکردنی داهات ناوزەد دەکرێت. گرێبەستی دابەشکردنی داهات هەروەکو چۆن لە ناوەکەیەوە دیارە واتە، لە سەرئەنجامدا داهاتی وەچنگهاتو پاش لێ دەکردنی گشت خەرجییە تێچوەکان لە نێوان هەرو لایەنەکەدا دابەش دەکرێت. سەرمایەگوزاریەکەش بەم شێوەیەیە، کە لە دوو خەرجی سەرەکی پێکدێت. سەرەتا سەرمایەی خەرجی تێچو بۆ دۆزینەوە و پەرەپێدانی سەرچاوە هایدرۆکاربۆنەکان تا دواقۆناغی بەرهەمهێنان (Cost Oil, Cost Gas)، کە ئەم سەرمایەیە سەرەتا تەنیا لە لایەن کۆمپانیای وازووکەری گرێبەستەکە دەخرێتە ئەستۆ.

پاشان سەرمایەی وەچنگاهاتوو (Profit Oil, Profit Gas) کە لە ئەنجامی فرۆشتنی بەرهەمە هایدرۆکاربۆنیەکانەوە دێت، کە ئەم سەرمایەیە لە نێوان حکومەتی خۆجێی و کۆمپانیای وازووکەرەکە پاش جیاکردنەوەی ( Profit Oil, Profit Gas) بە پێی ئەو بەندانەی (ڕێژەی دانەوەی خەرجییەکان بە %) کە لەسەرەتادا لە سەری ڕێککەوتون دابەشدەکرێت.

لە هێڵکاری ٥.٢ دا چونێتی دابەشکردنی سەرمایەی وەرگیراو پاش کرداری دەرهێنانی بەرهەمە

هایدرۆکاربۆنیەکان لە نێوان کۆمپانیای خاوەن گرێبەستەکەو حکومەتی خۆجێیدا ڕونکراوەتەوە.




هێڵکاری ٥.٢: چۆنێتی دابەشکردنی بڕی سەرمایەی وەرگیراو لە ئەنجامی فرۆشتنی بەرهەمە هایدرۆکاربۆنیەکان

هەربۆیەش لە سەرەتادا گشت کۆمپانیاکان بەوردی لێکۆڵینەوەی ئەو دۆکۆمێنتانە دەکەن کە لەلایەن حکومەتە خۆجێیەکانەوە بەناوی گرێبەستی دابەشکردنی داهات پێناسەکراون. وە ئەم دۆکۆمێنتانەش لە دونیای نەوت و گازی سروشتی دا ژمارەیان لە ٤٠ گرێبەست تێپەڕنابێت، بەڵام لە شوێنێکەوە یاخود لە حکومەتێکەوە بۆ حکومەتێکی تر زۆر جیاوازن.

لە هێڵکاری خوارەودا کاتی دیاریکراوی گشت قۆناغەکانی نێو گرێبەستەکان و چۆنێتی دارشتنی سەرمایەگوزاری و گێڕانەوەی سەرمایە لەو گرێبەستانەدا ڕونکراوەتەوە.







هێڵکاری ٥.٣: چۆنێتی دیاریکردنی بڕی سەرمایەی تێچو لە ئەنجامی بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز بە هۆی گرێبەستەکانەوە [World Bank].

هەروەکو لە هێڵکاری ٥.٣ دا دیاریکراوە، سەرەتا کردارەکانی ئامادەکاری پڕۆژەی نێو و گرێبەست، ڕوپێوکردنی ڕوبەرەکە، پەرەپێدانی کێڵگە و بەرهەمهێنانی سامانە سروشتییەکان بەسەر کۆمەڵە کاتێکی دیاریکراودا دابەشکراوە و بۆ هەر کارە ماوەیەکی دایاریکراو تەرخان دەکرێت، تا سەرئەنجام کاری بەرهەمهێنانی کێڵگەکە داوانەکەوێت و کۆمپانیاکە تا ماوەیەک بتوانێ سود لەو کێڵگەیە وەربگرێت.

هەرگرێبەستێک بۆ ماوەیەکی ١٠ تا ٦٠ ساڵ واژوودەکرێت و پاشان خاوەنداریێتی کێڵگە و گشت ئامێرەکان بۆ حکومەتی خۆجێی دەگەڕێتەوە. کاتی دیاریکراو پەیوەندی زۆری بە دابەشکردنی سامانی سروشتییەوە هەیە و کۆمپانیاکە تا تەوابونی وادەکەی لە بەرهەمەکان برابەش دەبێت. بۆیە ماوەی نێو گرێبەستەکان فاکتەرێکی زۆرگرنگن و دەبێت بە بەرپرسیارێتیەوە لێکۆڵینەوەو بڕیاری لەسەر بدرێت.

بەهەمان شێوەش بری سەرمایەی جولاوی نێو گرێبەستەکانیش فاکتەرێکی زۆر گرنگن کە دەبێت بە بەرپرسیارێتی لە نرخی بازاڕی سامانی سروشتی، کەگشت کۆمەلانی خەلکی خاوەنینی، مامەلەی لەگەلدا بکرێت.

لـــەم هێڵكاریـــەدا ٥.٣ بـــڕی پـــارەی وەرگیـــراو لـەلایـــەن حكومـــەتی خـــۆجێی بـــە پـــڕی و ڕەنگـــی ســـەوز وە و بـــڕی سـەرمایەی تێچووی خـەرجكراو لـەلایـەن كۆمپانیـایی خـاوەن گرێبـەستـەكە بـە خـەتێكی ڕنگی پرتـەقاڵی دەستنیشانكراوە.

سـەرەتا بـڕی سـەرمایەكە بـۆ حكومـەتی خـاوەن كێڵگـەكـە پۆزەتیفـە بـە هـۆی وەرگرتنـی بڕێكـی دیـاریكراوی سـەرمایە لەلایـەن حكومـەتی خۆجێییـەوە لـە كۆمپانیـای خـاوەن گرێبەسـتەكە لـە كـاتی واژووكردنـی گرێبەسـتەكەدا لـە ژێرنـاوی ئـەم خالانـەی خوارەوە وەردەگیرێت:

1. Signature Bonuses, XX,000,000, (sliding scale),
2. Rental payments (US$XX/km2),
3. Training fee (US$ XXX, 000 per year),
4. Local government and community benefits (Capacity Building). (US$ XX, 000,000)

پاش واژووكردنی گرێبـەستـەكە بـە شێوەیـەكی گشتی بـڕی سەرمایەی دیاریكراوی ئـەو بەشانـەی خـوارەوە وەردەگیرێت كـە پەیوەندیـەكی ڕاسـتەوخۆی بـە بـڕی سـەرمایەی هایـدرۆكاربۆنی هـەڵهێنجراو یـاخود ڕەوانـەكراو بـۆدەرەوەی وڵات هـەیە:

1. Royalties (sliding scale),
2. Production bonuses (sliding scale),
3. Corporate income tax,
3. Profit share of production (sliding scale),
4. Local government and community benefits (US$XXX,000 per annum).

هەروەها کۆمەڵێک شتی تر وەکو قەرەبوکردنەوەی گۆڕانکاری و شێواندنی ژینگەو لە ئەنجامی بوژاندنەوی بواری نەوت وگاز لە وڵاتدا کە لە کاتی ئیمزاکردنی گرێبەستەکاندا هەردوو لا لەسەری پێکدێن.

بەشێوەیەکی گشتی بڕی سەرمایەی وەرگێراو لەلایەن حکومەتی خۆجێییەوە لەساڵەکانی ١٩٧٤ وە لە بەرهۆی گرانبونی نرخی نەوت و خۆماڵیکردنی زۆربەی کۆمپانیاکان لەلایەن حکومەتە خۆجێیەکانەوە بەرەو سەرێ هەڵکشا. بەهۆی ئەم گوێزانەوەی سەرمایەوە لە کاتی ئیمزاکردنی گرێبەستەکەدا ئەوا حکومەتی خاوەن کێڵگەکە بڕێک پارەی پێگەیشتوە واتە پۆزەتیفە، بەڵام کۆمپانیاکە بە بڕی نێگەتیف پارەی لەدەست داوە بەبێ ئەوەی هێچ کارێکی بەدواگەڕان و پەرەپێدانی نێو کێڵگە نەوتیەکەی ئەنجام دابێت.

لەم گرێبەستەدا برابەشکردن و شەریککردنی کۆمپانیایەکی بیانی لە سامانی سروشتی وڵات مەزنترین سەرمایە یە کە کۆمپانیاکە لە سەرتای واژووکردندا پێیدەگات.

پاشان کۆمپانیاکە هەڵدەستێت بە کاری ڕوپێووکردن (Exploration)، و پەرەپێدانی کێڵگەکە (Field Development). تا گەیشتن بە کاری دەرهێنانی نەوت (Start of Production) و فرۆشتنی بەرهەمەکان. تا ئەم قۆناغانەش حکومەتی خوجێی هیچ سەرمایەیەکی سەرف نەکردوە و بەڵام کۆمپانیاکە گشت ئەرکەکان دەگرێتە ئەستۆی خۆی.

لێرەدا پێناسەی ڕیسک (ئەمان) دێتە ئاراوە (Risk)، کەئەم خەرجیانە هەروەکو باسکران، گشتیان بە ( Cost Oil, Cost Gas) پێناسەدەکرێن. واتە ئەگەر کاری بەدواگەڕانی سەرچاوە هایدرۆکاربۆنەکان ئەنجامێکی سەرکەوتوی نەبوو ئەوا کۆمپانیای خاوەن گرێبەستەکە بەهیچ شێوەیەک قەرەبوو ناکرێتەوە. بەڵام هەمیشە دەبێت ( Cost Oil, Cost Gas) لە ژێر چاودێری کۆمەڵێکی شارەزادا بێت، تا لە بڕی ئاسایی خۆی تێنەپەڕێت و زیادەڕەوی نەکرێت، چونکە زۆربەی کۆمپانیاکان بڕی پارەی سەرمایەی تێچوو بەشیوەیەکی خەیاڵی دەنوسن کە نیوەی قازانجە.

لەدوای دەستپێکردنی قۆناغی بەرهەمهێنان ( Start of Production) تا دوا قۆناغی بەرهەمهێنان ( End of Production) کۆمپانیاکە و حکومەتی خۆجێی گشت قازانجی فرۆشتنی بەرهەمەکان بە پێی ڕێکەوتنی نێو گرێبەستەکە لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکەن. بڕی قازانجی دابەشکراو پەیوەندیەکی زۆری هەیە بە نرخی نەوت و بەرهەمە هایدرۆکاربۆنەکان هەیە لە بازاڕە جیهانیەکاندا.

لە گرێبەستەکانی دابەشکردنی داهاتی نەوتی (PSA) نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و گشت کۆمپانیاکانی نەوت سود لەم فاکتۆرانەی (Commercial Terms) نێو ئەم خشتەیەی خوارەوە وەرگیراوە. لەم خشتەیەدا گشت ڕوبەری ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەسەر سێ بەشی ڕیسکی کەم، مامناوەندی و ریسکی زۆر دا دابەشکراون. لێرەدا ڕونییە کە بە پێی چ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی ئەم پۆلێنکردنە هاتۆتە ئاراوە. هەروەکو لە خشتەکە دا ئاشکرایە، حکومەتی هەرێمی کوردستان جیاوازی دەخاتە نێوان بوژاندنەوەی کێڵگەی گازی سروشتی و کێڵگەی نەوتی خاو.

## خشتەی ٥.٢: گشت فاکتۆرە ئابوریەکانی نێو گرێبەستەکان لە هەرێمی کوردستاندا

| TABLE - 1A | KURDISTAN REGION RISK/REWARD COMMERCIAL GUIDELINES FOR EXPLORATION | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | Low Risk Area | | Medium Risk Area | | High Risk Area | |
| DESCRIPTION | Allowable | Oil | Gas | Oil | Gas | Oil | Gas |
| Royalty from Total Petroleum after field operations consuption | Minimum | 10.00% | 10.00% | 10.00% | 10.00% | 10.00% | 10.00% |
| Available Petroleum after Royalty | Maximum | 90.00% | 90.00% | 90.00% | 90.00% | 90.00% | 90.00% |
| Cost Petroleum as % of Available Petroleum | Maximum | 40.00% | 50.00% | 43.00% | 53.00% | 45.00% | 55.00% |
| Cost Petroleum as % of Total Petroleum | Maximum | 36.00% | 45.00% | 38.70% | 47.70% | 40.50% | 49.50% |
| Total Profit Petroleum after Cost Petroleum as % Available Petroleum | Minimum | 60.00% | 50.00% | 57.00% | 47.00% | 55.00% | 45.00% |
| Total Profit Petroleum after Cost Petroleum as % Total Petroleum | Minimum | 54.00% | 45.00% | 51.30% | 42.30% | 49.50% | 40.50% |
| **Contractor's Share of Total Profit Petrolem:** | | | | | | | |
| Share of Profit Petroleum For R-factors between "A" and "B" | Maximum | 25 - 30% | 30- 35% | 30 - 35% | 35 - 38% | 35 - 38% | 38 - 40% |
| Share of Profit Petroleum For R-factors between "B" and "C" | | formula | formula | formula | formula | formula | formula |
| Share of Profit For R-factors Greater than "C" | Maximum | 13 -15% | 15 - 18% | 15 - 16% | 18 - 20% | 16 - 18% | 20 - 22% |
| **Share of Profit Petroleum Formula Applied between B and C** | | **R-factor*[(profit@B-Profit@C)/(R-factor@C-R-factor@B)]** | | | | | |
| **R - factors:** | | | | | | | |
| Starting Point "A" | Fixed | 0.0000 | 0.0000 | 0.0000 | 0.0000 | 0.0000 | 0.0000 |
| Point "B" | Fixed | 1.0000 | 1.0000 | 1.0000 | 1.0000 | 1.0000 | 1.0000 |
| Point "C" | Maximum | 2.0000 | 2.5000 | 2.2500 | 2.7500 | 2.5000 | 3.0000 |

**Notes:**

*1) Cost Petroleum available is limited to unrecovered costs*
*2) Surplus Cost Oil after reaching R-factor of 1.000 is added back to Profit Petroleum*
*3) R-factor = Cumulative Revenues Received by Contractor/Cumulative Costs Incured by Contractor*
*4) For Blocks that may contain proven petroleum or Discovry the above terms may vary accordingly*
*5) Government participation may vary from 10% to 25%, fully carried by Contractor during Exploration phase*

**General Guidelines:**

_ The Minimum and Maximum Figures are for guidence only, KRG will favour competative bids on these figures
_ There are no hard data on Exploration Blocks offered, so bidders need to rely on their own searches and regional knowledge
_ Block Areas and Co-ordinates together with any settalite or topographic information will be available for each Block

| TABLE - 1B | KURDISTAN REGION RISK/REWARD COMMERCIAL GUIDELINES FOR EXPLORATION |
|---|---|
| Bonuses, Training and Contributions | Guidelines |
| Signature Bonuse | Required for all Blocks, Bidders to propose their best amounts |
| Capacity Building Contribution Fund | Recommended for all Blocks, Bidders to propose their best amounts |
| Production Bonuse at commencement of production | Required for all Blocks, Bidders to propose their best amounts |
| Production Bonuse at Cumulative Production of 10 MMBO Equivalent | Required for all Blocks, Bidders to propose their best amounts |
| Production Bonuse at Cumulative Production of 25 MMBO Equivalent | Required for all Blocks, Bidders to propose their best amounts |
| Production Bonuse at Cumulative Production of 50 MMBO Equivalent | Required for all Blocks, Bidders to propose their best amounts |
| Trainining Fund during Exploration Phase and Production years | Required for all Blocks, Bidders to propose their best figures per year |
| Contribution to Environmental Fund - Exploration and Production years | Required for all Blocks, Bidders to propose their best figures per year |

بۆ ڕونکردنەوەی زێدەتری چۆنێتی دابەشکردنی سەرمایەی وەرگێراو لە بەرهەمە هایدرۆکاربۆنییەکان لە چوارچێوەی گرێبەستەکانی هەرێم لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانی بەهۆی لێدوانێکی بەرپرسی سامانە سروشتییەکان لە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دوو هێڵکاریدا شیدەکەمەوە [٢٣]. لەم شیکردنەوەی ئەم بەرپرسەدا بڕی فاکتۆری R نەهاتووە، ئەم فاکتۆرە لە

دەرئەنجامی دابەشکردنی بڕی پارەی وەچنگهاتووی قازانج (Profit Oi) بە سەر بڕی پارەی تێچوو (Cost Oil) دێتە ئاراوە. دیارە مەبەستی ئەو بەرپرسە لەم لێدوانەیدا کاتێکە کە بڕی (R<1) لە ١ کەمتر بێت. وە ئەگەر بڕی (R>2) لە ٢ گەورەتر بێت ئەوا شیکردنەوە ئابوریەکە کۆمەڵە دەرئەنجامێکی تری دەبێت.

لە هێڵکاری ٥.٤ دا لە پاش گەیشتن بە قۆناغی بەرهەمهێنان بڕی خاوەنداریێتی وڵاتی (١٠%) لێدەردەچێت و پاشان پارەی تێچوی خەرجکراوی کۆمپانیا نەوتەکەی (Cost Oil) لێدەردەچێت و بڕی پاشماوەش کە بە قازانجی نەوت (Profit Oil) ناوزەد دەکرێت، بەو شێوەییەی خوارەوە دابەشدەکرێت.




هێڵکاری ٥.٤: چۆنێتی شیکردنەوەی لایەنی ئابوری گرێبەستەکان

لــە هێڵکــاری خــوارەوەدا ٥.٥ پــاش گێڕانــەوەی گشــت خەرجیــەکانی کۆمپانیــا نەوتــە کــە ئاوەهــا بــڕی قــازانجی فرۆشــتنی ســامانە سروشــتیەکان لــە نیــوان کۆمپانیــای ئیمزاکــــەری گرێبەســــتەکەو حکومــــەتی هــــەرێم دا دابەشدەکرێت. ئـەم لێکدانەوەیـە کاتێـک دێتـە ئـاراوە کـە حکومەتی ناوەندی گرێبەستەکانی حکومەتی هەرێم لەگەڵ کۆمپانیابیانیەکان بەفەرمی بناسێت.




هێڵکاری ٥.٥: دابەشکردنی بڕی قازانجی فرۆشتنی نەوت لە نێوان لایەنەکاندا

وردەکاریـە ئابوریـەکانی گرێبەستی دابەشکردنی داهات لـە نێوان حکومـەتی هـەرێمی کوردستـان و کۆمپانیـای وێستـەرن زاگرۆسـی نـەوتی لـە سـەر بلـۆکی بـاوەنور بـەم شێوەیەیی کـە لـە هێڵکاری ٥.٦ دا هـاتوە ئیمزاکراوە. ئـەوی شـایەنی باسـە لـەم گرێبەسـتەدا (٤٥%) بـڕی پـارەی وەچنگهاتوە (Oil Revenue) دەچێتـە بواری گێڕانـەوی پارەی خەرجکراو (Cost Oil) . لە نمونەکانی ڕابوردودا بـڕی (٤٠%) بۆ گڕانـەوەی پارەی خـەرجکراو (Cost Oil) تـەرخان کرابوو.




هێڵکاری ٥.٦: وردەکاریەکانی دابەشکردنی داهات
لە گرێبەستی بلۆکی باوەنور دا [٢٥]

بەشێوەیەکی گشتی لە کاتی داڕشتنی چوارچێوەی ئابوری بۆ هەر گرێبەستێکی بواری هایدرۆکاربۆنیەکان پێویستە (Oil and Gas Fiscal Framework) ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕچاوبکرێت:

١. بوژاندنەوی تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز و خوڵقاندنی بواری کاری پێشکەوتو و پڕ ئەزمون بۆ دانیشتوانی هەرێم لەو بوارەدا،

٢. خوڵقاندنی بواری کار بۆ گەشەکردنی سەرمایەدار و کۆمپانیای خۆماڵی پێشکەوتو لە بواری نەوت وگازدا،

٣. بەروسەرێ بردنی بڕی پارەی وەچنگاتوو لەلایەن حکومەتی خۆجێییەوە واتە (government take for oil and gas higher).

٤. بڕیار بۆ دانانی بڕێکی دیاریکراوی باج(income tax).

٥. ئاگاداری و چاودیری Cost oil کە لە بڕی دیاریکراوی خۆی تێنەپەڕێت، وەهەردەم بەراوردی ئەو خەرجییەی لە نێوان گشت کۆمپانیاکاندا بکرێت.

٦. گوێزانەوەی Know-how لە بواری پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای نەوت وگازی سروشتیدا بۆ نێو چوارچێوەی زانکۆکانی حکومەتی خۆجێیی،

٧. پێگەیاندنی کادیری ناوخۆ بۆ بوژاندنەوە و ڕاپەڕاندنی کارەکانی بواری نەوت و گاز لە ئایندەدا بەهۆیانەوە،

٨. چوارچێوەیەکی ئابوری نەگۆڕ بە پێی هەڵسەنگاندنی ئاشکرا و تایبەتمەندی سەرچاوە سروشتییەکان،
٩. چوارچێوە ئابوریەکە، گشت بەرهەمەکانی تری وەچنگهاتوی هایدرۆکاربۆنی بگرێتەوە.

هەربۆیەش دەبێت بۆ بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز لە هەرێمەکەماندا بە لێکدانەوەی باری ئابوری و پاراستنی سامانە سروشتیەکان و هەوڵدان بۆ پاراستنی ژینگەو پێگەیاندنی کادیری شارەزا بۆ ئاینده لە کوردتساندا لە ئەم گرێبەستانە بە شێوەیەکی زانستی بکۆڵرێتەوە.

هەربۆیەش تا ئەمڕۆش مشتومڕی یاسای بونی ئەوگشت گرێبەستە نەوتیانەی کە لە نێوان کۆمپانیا نەوتیەکان و حکومەتی هەرێم لەلایەن حکومەتی ناوەندیی بەغدادەوە لە بەر ئاشکرا نەبونی ناوەرۆکەکەی هەربەدەوامە. ئەم شرۆفەکردنی یاسای بونی گرێبەستە نەوتیەکان زۆر لایەنی ناوخۆی هەرێمی و دەرەوەی هەرێمی بە خۆیەوە مەشغوڵ کردووە.

لایەنی دەرەکی بەتایبەتی وەزارەتی نەوتی ئێراقی بە بیرۆکەی هەمان سیاسەتی کۆنیان دەڵێن: حکومەتی هەرێمی کوردستان نابێت ڕاستەوخۆ لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکاندا دانوستان بکات و حەقی ڤیتۆی گشت گرێبەستەکان بۆ حکومەتی ناوەندنی دەگەڕتەوە، چونکە

سامانی نەوت و گاز پایەو بنەمای حکومەتی ئێراقە.

حکومەتی ناوەندنی بەغداد بەم شێوەیە دەیەوێت قورسایی سیاسی حکومەتی هەرێم لەناوچەکەدا کەم بکاتەوە چونکە فرۆشتنی نەوتی خاو (right to sell) لە هەر بازاڕێک دابێت گرنگ نی یە، بەهەمان شێوە ئەوان دەیانەوێت ئێمە لە تەکنۆلۆجیای پەرەپێدانی نەوت وگازەوە دوربگرن.

بەڵام ئایا چ کۆمپانیایەک ڕێگەی ئیشپێکردنی لە هەرێمی کوردستاندا پێدەدرێت؟

ئایا تەکنۆلۆجیای نەوت و گاز دەکەوێتە چ دەڤەرێکەوە؟ ئەپراسیارانە گەورەترین کارتی سیاسی ئابورین کە دەبێت لە دەستی حکومەتی هەرێمی کوردسیاندا بمێنێتەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە بەپێ لێکدانەوەی قانونی ئەساسی ئێراق بە پێی بەندەکانی (١٠٥، ١٠٦، ١١١، ١١٢ بڕگەی یەکەم، دووەم و سێهەم، و مادەی ١٢١) بە پێی یاساناسەکان حکومەتی هەرێم گشت توانایەکی مامەڵەو دانوستان کردنی پێدراوە چونکە لەو یاسایەدا گشت کۆمەڵانی خەڵکی ئێراق لە هەرشوێنێک بن خاوەنی نەوتی ئێراقن.

لە بەندی ١١٠ دا چوارچێوەی یاسایی حکومەتی فیدرالی ئێراق ڕونکراوەتەوە کە بە هیچ شێوەیەک سامانی سروشتی هایدرۆکاربۆنەکان لە ژێر ڕکێفی حکومەتی ناوەندی بەغداد

دا نی یە. واتە پێدانی ئەم هێزە ئابوریە سیاسیە بە حکومەتە فیدراڵەکانی نێو ئێراق، ئەم وڵاتە لە دروستبونەوەی دیکتاتۆری و یەک دەستەڵاتی دەپارێزێت.

هەر لە ژێر ڕۆشنایی دەستوریی هەمیشەی وڵاتی ئێراق دابوو کە پەرلەمانی هەرێمی کوردستان لە بەرواری ٢٣.٠٧.٢٠٠٧ یاسای نەوت و یاسای وەزارەتی سامانە سروشتییەکانی پەسەند کرد و ئەم یاسایانەش بە پێی ئەو بەندانەی سەرەوە شەرعیەتی لە دەستوری هەمیشەیی ئێراقەوە پێدراوە. هەروەها لە بەندی ١٤١ دا بەفەرمی ناساندنی گشت یاساکانی نێو چوارچێوەی کاری حکومەتی هەرێمی کوردستانە کە لەساڵی ١٩٩٢ وە لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە هەموارکراون.

کاتێک وڵات بە وڵاتێکی فیدراڵی پێناسە دەکرێت کە حکومەتی ناوەندی فیدراڵ و حکومەتی هەرێمەکان حەقی پراکتیزەکردنی مافی تایبەتی خۆیان هەبێت. ئەو مافانەی کە پەیوەندی بە کۆمەلانی خەڵکی هەرێمەکان هەبێت، ئەوا هەرێمەکان خۆیان لێی بەرپرسیار دەبن، یاخود بە هاوکاری لەگەڵ ناوەندا لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، وە ئەم بەرپرسیاریە هاوبەشیانەش لە دەستوی گشتی وڵاتدا ڕوندەکرێنەوە.

پەسەندکردنی یاسای نەوت و یاسای وەزارەتی پەیوەندیداریش لەلایەن پەرلەمانی هەڵبژێردراوی هەرێمی

کوردوستانەوە وەکو گشت وڵاتان و هەرێمەکانی دونیا بە قۆناغە ئاساییەکانی خۆیدا تێپەڕی. لە هێڵکاری ٥.٤ خوارەوەدا بە شێوەیەکی ساکار گشت قۆناغەکان تا گەڵاڵەکردنی گرێبەستە هایدرۆکاربۆنیەکانی نێو وەزارەتی پەیوەندیدار دەستنیشان کراوە. لەم ڕاستایەوە بەو سەرئەنجامەش دەگەین کە دەبێت یەک گرێبەستی نەگۆڕ لە کاتی دانوستانەکاندا لە نێوان حکومەتی خۆجێی و کۆمپانیاکان لە ئارادابیت.




هێڵکاری ٥.٧: چۆنێتی گەیشتن بە گرێبەستە هایدرۆکاربۆنیەکان بەشێوەیەکی یاسایی.

هەربۆیەش لە ئێراقی نوێدا بە پێی دەستور گشت کۆمەڵانی خەڵک لە زاخۆ وە تا بەسرە خاوەنی ڕاستەقینەی گشت سامانە سروشتیەکانن. زۆربەی لێکۆڵەرەوە بیانیەکان

لە بارەی نایابی و دەگمەنی نەوتی کەرکوک بەتایبەتی و کوردستان بەگشتی دەنوسن و ئێستاکە خۆشمان دەزانین کە نەوتی کوردستان زۆر سوکە (API=30 - 47) کەواتە دەتوانرێ زۆر بەئاسانی و خێرا بۆ مادەی سوتەمەنی (بەنزین) وەربگێڕدرێت چونکە لە بەر سوکی نەوتەکەی پێویستی بە هەوڵی بەردەوامی ئامادەسازی کراکن (Cracking) کەمە وەهەروەها گازی سروشتیەکەشی زۆر شیرینە.

کە ئەم تایبەتماندیانە گرنگترین خاڵی سەرەکین بۆ گەڵاڵەکردنی هەرگرێبەستێک. کەواتە کەم کێڵگەی نەوتی جیهانی هەیە کە ئەم تایبەتمەندییەی کێڵگە نەوتیەکانی کوردستانی هەبێت. سەرەڕای سوکی کەمی گۆگردی (S) نەوتەکەی پێویستی بە زۆر قۆناغی پاڵاوتن نیە، لە بەراورد لەگەڵ نەوتی وڵاتانی دی.

ئەم تایبەتمەندیانەی کانزافۆسیلیەکان گەورەترین سامانی سروشتین بۆ هەرێمەکەمان ئەگەر دەستبەسەراگرتن، بەکارهێنان و دەرهێنانی گشت سامانە ژێرزەویەکان بەتایبەتی نەوت و گازی سروشتی لە ژێر کۆنترۆڵی دەستەڵاتی حکومەتی فیدراڵی دیمۆکراتی هەڵبژێردراوی ناوچەییدا واتە هەرێمی کوردستاندا بێت، نەک حکومەتی ناوەندیی بە ئارەزوی خۆی بەڕێوبردن و بەکار هێنانی بخاتە ژێر توانای دەستەڵاتی خۆی.

هەر وەکو چۆن لە ساڵی ١٩٢٠ وە تا ئێستا ئەم دەستەڵاتە لە لایەن حکومەتی مەرکەزیەوە پراکتیزەدەکرێت و نەک هیچ بەرهەمێکی بۆ هەرێمەکەمان نەبووە بەکو جگە لە بەتاڵان بردنی و بەهۆی فرۆشتنی بەرهەمەکەیەوە، کوردستانەکەمانیان خاپور و گەلەکەیان جینوساید کردووین.

بە تێڕوانی مێژووی بڕ نەهامەتی وڵاتەکەمان بۆ مان ڕوندەبێتەوە کە ئەو گشت گرفتانەی کە تا ئەمڕۆکە ئێمە بەدەستیەوە دەناڵێنین هەر ڕەنگدانەوەی بوونی ئەم تایبەتمەندیانەی وزەییە (لەگەڵ سەرچاوەکانی ئاوی شیرین) لە وڵاتەکەماندا. کەواتە کاتی ئەوە هاتوە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەم بەرهەمانە بکاتە سەرچاوەی خۆشگوزەرانی و دیموکراتی لە هەرێمەکەماندا.

بەداخەوە لە مێژووی هاوچەرخی گەلەکەمان تا ئێستاکەش فەرمانڕوا ڕامیارەکانی گەلەکەمان نەیانتوانیوە کە خواستەکانی گەلەکەمان بە تەریبی لەگەڵ خواستەکانی زلهێزەکانی جیهان بە هاوشانی یەکتری بگەیەننە ئامانجی ئارەزو بۆکراوی گشت هاوڵاتیانی کوردستان. بەکورتی هێورکردنەوی ناومالّی کوردی و پاشان بەئاگاکردنەوی بیروڕای جیهان لە خواستەکانمان تاکە ڕێگەی گەیشتنمانە بە نیشتیمانێکی سەربەخۆ. کە لەو نێشتیمانەدا خۆمان خاوەنی بەروبومی زەخیرەی ژێرزەوی نیشتیمانەکەمان بین.

لەڕوانگەی هەمان ئارەزوی وڵاتە ڕۆژئاواییەکانە بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە لەلای ئەوان و بۆ مەرامی وڵاتەکانیان زەخیرە ژێرزەویەکانمان زۆر لە خواست و ئارزەوی مرۆڤەکانی ئەم ناوچەیە گرنگترە.

ئەم ئارەزوە لە نێو پسپۆڕانی بواری نەوت و گازی سروشتی لە جیهاندا بۆتە هۆی خوڵقاندنی نوێترین و گەرمترین موناقەشەی ئەمڕۆکە، کە گوایا ئایا کێ و چون کۆمپانیا گەورەکانی جیهان بواریان بۆ دەرەخسێت بەشداری لە هەڵکەندن، هەڵهێنجان و بوژاندنەوەی گشت کێڵگە دارماوە کۆنە نەوتیەکانی ئێراق بەگشتی و هەرێمی کوردستان بەتایبەتی بکەن.

داواکاری گشت کۆمپانیاکانی بواری نەوت بۆ واژووکردنی گرێبەستی تر لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان بەڵگەی سەلمێنراوی ئەم ڕاستیانەن. چونکە گەیشتن بە سەرچاوەی هایدرۆکابۆنییەکان بەتایبەتی نەوت وگازی سروشتی لەسەر ڕوی زەوی زۆر دژوارە. بە هۆی دایەگرامی خوارەوەوە ٥.٨ ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕوندەبێتەوە کە تەنها وڵاتی ئێراق ماوە کە بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی گرێبەست و کۆمپانیا نەوتییە جیهانییەکان. بڕی ١٠ % گشت سامانی سروشتی نێو ئێراق و هەرزانی دەهێنانی نەوت لە وڵاتداً ئەو بابەتە بەڵگە نەویستەیە کە گشت جیهانی پیشەسازی بەسەرنجەوە چاوەڕوانی دەکەن.







هێڵکاری ٥.٨: گرنگی سەرچاوە هایدرۆکاربۆنییەکانی ئێراق
بۆ گشت دونیای پیشەسازی [١٨]

سیاسەتی ڕاکێشانی کۆمەڵە کۆمپانیاییەکی زۆر بۆ پەرپێدان و بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت وگازی سروشتی لە هەرێمی کوردستاندا یەکێکە لە ڕێڕەوە گرنگەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان. هەربۆیەش لە بری هێشتنەوەی هەرێمی کوردستان بە بلۆکێکی مەزن، هەوڵدراوە هەرێمی کوردستان بەسەر کۆمەڵە بلۆکێکدا دابەش بکرێت. لە نەخشەی خوارەوەدا ٥.٩ چۆنێتی دابەشکردنی هەرێمی کوردستان بەسەر کۆمەڵێک بلۆکدا دەستنیشان کراوە. بەڵام پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە

ئایا بە پابەندبون بە چ معیارێکی ڕوپێوکردن و جیۆفیزیکی هەرێمی کوردستان بە سەر ئەم بلکۆکانە دابەشکردن؟ سەرەڕای ئەمانە هەبوونی سامانێکی سروشتی هایدرۆکاربۆنی بێئەندازە لە هەرێمەکەماندا و گۆڕانکاری سیاسی لەر بەراورد لەگەڵ سیستەمی ئێراقی کۆندا لە پاش ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس لە ساڵی ٢٠٠٣ سەرەکیترین هۆکاری نزیکبونەوەی گشت کۆمپانیا بیانیەکانە.

بەپێی گرێبەستەکان ئەو کۆمپانیایانە ئەتوانن کاری ڕوپێووکردن و پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای نەوت وگازی سروشتی لە هەرێمی کوردستاندا ڕاپەڕێنن، هەربۆیەش پاش دانوستیانێکی زۆر هەریەک لەئەو کۆمپانیایانە توانویانە یەکێک لە بلۆکانە وەربگرن.

هەروەها لە خشەتی ٥.٤ دا ناوی کۆمەڵێک کۆمپانیاو ئەو بلۆکانەی کە لە حکومەتی هەرێمی کوردستان وەریانگرتووە خراوەتە پێش چاوی خوێنەرانی ئازیز. ئەم کۆمپانیایانە بەهۆی گرێبەستی نێوان ئەوان و حکومەتی هەرێمی کوردستان کاری بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتیان لە نێو چوارچێوەی جوگرافی هەرێمی کوردستان خستۆتە ئەستۆی خۆیان. ئەم زانیاریانە لە سایتی فەرمی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە وەرگێراوە [١٦].




نەخشەی ٥.٩: دابەشکردنی سنوری جوگرافی هەرێمی کوردستان بەسەر چەندین بلۆکدا [٢٦]

## خشتەی ٥.٤: ناوی کۆمەڵە کۆمپانیایەک کە کاری گرێبەستی نەوتی لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستانیان ئەنجام داوە [١٦]

| No | Logo | Company | Field |
|---|---|---|---|
| 1 | دانة غاز DANAGAS | کۆمپانیای داناگاز لە کەنداوی فارسدا | Khor-Mor Chamchaml |
| 2 | | کۆمپانیای نەوتی هیلال | Khor-Mor Chamchaml |
| 3 | DNO | کۆمپانیای د.ن.ۆی نەرویجی | Tawke, Hawler |
| 4 | THK·BP ТНК bp | کۆمپانیایەکی ڕوسی | Hawler |
| 5 | KNOC Korea National Oil Corporation | کۆمپانیای گشتی نەوتی کۆریای باشور | Hawler, Bazian, Sangaw South, Sangaw North and Qush Tappa |
| 6 | HERITAGE | کۆمپانیای هێرەتیجی بەریتانی | Meeran |
| 7 | Topco | کۆمپانیای تەق تەق | Taqtag, Kewi Charmala |
| 8 | Hunt HUNT OIL COMPANY OF CANADA, INC. | کۆمپانیای هەنتی ئەمریکی | Kand, Nerjis, Ain Sifni |
| 9 | OMV OMV | کۆمپانیای ۆ.م.ڤێ ی نەمسایی | Mala Omar, Shorish |
| 10 | HILLWOOD A PEROT COMPANY | کۆمپانیایەکی ئەمریکی | Sarsang |
| 11 | westernZAGROS | کۆمپانیای وێستەرن زاگرۆس | Bawanoor |
| 12 | GULF KEYSTONE PETROLEUM LTD. | کۆمپانیای گۆڵف ستۆن کیی پترۆلیۆم | Shaikan, Akre-Bijil |
| 13 | MOL | کۆمپانیایەکی هەنگاری | Shaikan, Akre-Bijil |
| 14 | Aspect Energy, LLC | کۆمپانیایەکی ئەمریکی | Atrush |

| No | Logo | Company | Field |
| --- | --- | --- | --- |
| 15 | PERENCO | کۆمپانیایەکی ئێرێنکۆی فەرەنسی | Sindi, Amedi |
| 16 | Reliance Industries Limited | کۆمپانیایەکی هیندی | Rovi, Sarta |
| 17 | P | کۆمپانیای پیت ئۆیڵ | Bina Bawe |
| 18 | NORBEST | کۆمپانیای نۆر بێست | Hawler |
| 19 | TALISMAN ENERGY | کۆمپانیای تالیسمان | Kalar, bawanoor |
| 20 | Vast Exploration | کۆمپانیای ڤەست ئێکسپلۆرەیشن | Qara Dagh |
| 21 | OIL SEARCH LIMITED | کۆمپانیای ئۆیل سێرچی ئوستراڵی | Shakal |
| 22 | P. Prime | کۆمپانیای پرایمی ئەمریکی | Shakal |
| 23 | Santos | کۆمپانیای سانتۆس | |
| 24 | Longford Energy<br>LONGFORD ENERGY | کۆمپانیای لۆنگفۆرد ئینرجی | Chia Surkh |
| 25 | Komet | کۆمپانیای کۆمێت | |
| 26 | SHAMARAN petroleum corp | کۆمپانیای شامەران پترۆلیۆم گروپ | Pullkana, Arbat, K42 |
| 27 | NIKO RESOURCES LTD | کۆمپانیای نیکۆ | Qara Dagh |
| 28 | MARATHON | کۆمپانیای ماراسۆن ئۆیڵ | Harir, Safin, Atrush and Sarsang |
| 29 | MURPHY OIL CORPORATION | کۆمپانیای مۆرفی ئۆیڵ | Dohuk |

## خشتەی ٥.٥: ناوی وڵاتی کۆمپانیا بەشداربووەکان

| ناوی وڵاتەکان | | ناوی کۆمپانیاکان |
|---|---|---|
| Austria | | (OMV) |
| Australia | | (Vast Exploration) |
| Canada | | (Heritage Oil, Impulse Energy, Talisman Energy, Longford Energy, Shamaran) |
| France | | (Perenco) |
| Hungary | | (MOL) |
| India | | (Reliance Industries) |
| Norway | | (DNO) |
| Russia | | (TNK-BP) |
| South Korea | | (KNOC, Daesung Industrial, Samchully, Bum-Ah Resource Development, UI Energy, GS Holdings, Majuko) |
| Switzerland | | (Addax Petroleum) |
| Turkey | | (Genel Enerji, A&T Petroleum) |
| United Kingdom | | (Gulf Keystone Petroleum) |
| United States | | (Hillwood International Energy, Sterling Energy, Aspect Energy, Texas Keystone, Kalegran, WesternZagros, Hawler Energy, Hunt Oil, Prime), Marathon Oil Coperation |

لە خشتەی ٥.٥ سەرەوەدا ناوی وڵاتی کۆمپانیاکانی کە لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان گرێبەستیان واژووکردوە خراوەتەڕوو. هەروەکو ئاشکرایە زۆربەی وڵاتەکان بەشدارن لە بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت وگازی سروشتی لە هەرێمی کوردستاندا، بەڵام ئایا ڕێڕەوی سیاسەتی گشتی ئەم وڵاتانە لە ڕاساتای بوژاندنەوەی ئەو تەکنۆلۆجیاییە لە هەرێمەکەماندا؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لێکۆڵینەوەی زۆرتری دەوێت.

سەرەڕای ئەمانە لە چوارچێوەی جوگرافی دەوڵەتی ناوەندیی ئێراقیشەوە، پاش ڕوخانی ڕژێمی فاشستی بەغداد، کۆمەڵە کۆمپانیایەکی بیانی (بەو بیانوویەی کە گوایا ئابوری ئێراق لە دارمان دایە و وڵات خۆی توانای بوژاندنەوە، چاکسازی و بەرهەمهێنانی نەوتی بەشێوەیەکی پێشکەوتو نیيە) خەریکی واژووکردنی گرێبەستێکی کۆنی بواری نەوتن لە ئێراق بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە ژێر ناوی هەمان PSAs واتە: ( Production Sharing Agreements ).

بە پێی ئەم گرێبەستە ئیدی گشت سەرچاوە سروشتییە هایدرۆکاربۆنییەکانی نێو وڵات بە کراوەیی دەمێننەوە و کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانیی (International Oil Company:) (IOC) دەتوانن گشت ئەرکەکانی پەرەپێدان و بەرهەمهێنانی سەرچاوە هایدرۆکاربۆنییەکان بگرنە ئەستۆی خۆیان.

بە پێی ئەم گرێبەستە کۆمپانیا بەڵێندەرەکە نزیکەی چەند دەرسەد لە پاش فرۆشتن وەردەگرێت لە حکومەتی خاوەن کێڵگە نەوتی و گازەکان و ئیدی گشت ئەرکەکانی لێدانی بیر و دەرهێنان و فرۆشتنی نەوتەکە دەکەوێتە ئەگەر لە ئەستۆی خودی کۆمپانیاکە دا بێت، ئەوا شانسی ئەوەی کە کادیرانی وڵاتەکەمان پێبگەن و لەو بوارەدا پسپۆڕبن زۆر کەمە. چونکە ئەو کۆمپانیایانە خۆیان کۆنترۆڵکەری گشت کێڵگەکان دەبن نەک حکومەتی خۆجێیی.

کە ئەم گرێبەستە بە شێوە کلاسیکیەکەی خۆی لە بواری دەرهێنان و دابەشکردنی نەوتدا لە زۆر جێگەی ئەم دونیایە سودی لێوەردەگیرێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ستراتیجیەتی نەوتی ئێراق دا ناگونجێ. چونکە هەڵهێنجانی نەوت لەم دقەرەدا بەهۆی قوڵنەبونی کێڵگەنەوتیەکان ئاسانە و زۆربەی کێڵگەنەوتیەکان ئاشکران و بۆ هەڵهێنجانی پێویستیان بە تەکنۆلۆجیای دژوارنیە و ئێراق خۆی خاوەنی کادیری شارەزای بواری نەوت و گازی سروشتییە. هەر لە بەر ئەم هۆیەیە کە حکومەتی ئێراق گرێبەستی (TSAs) واتە ( Technical Service Agreements) بۆ ماوەی کەمتر لە ٥ ساڵ لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانی (IOCs) واژوودەکات. لە تێڕوانینێکی ترەوە هیچ یەک لە وڵاتانی خاوەن نەوتی کەنداو (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لەم جۆرە گرێبەستەیان

(PSA) لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکان بۆ دەرهێنانی، پاڵاوتن و دابەشکردنی نەوت ئیمزانەکردوە.

بەڕاشکاوی بە لەبەرچاوگرتنی باری ئابوری و نەبونی شارەزایانی تەکنیکی لە بواری دەرهێنانی نەوتی خاو و شیرینکردن و خاوێنکردنەوەی گازی بن زەوی لە هەرێمەکەماندا بەتایبەتی بەو سەرئەنجامە دەگەین کە لە هەرێمی کوردستاندا پێویستیمان بە هاوکاری تەکنیکی و هێنانەناوەی پسپۆڕانی وڵاتانی دەرەوە و سەرمایەکی زۆرهەیە بۆ هەڵکەندنی چاڵە نەوتی و گازیەکان و دانانی گشت وێستگەکانی پاڵاوتنی نەوت و پاک کردنەوەی گازی سروشتی. یەکێک لەو گرێبەستانە کە دەتوانرێت پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لە هەرێمەکەماندا پاش هێنانەناوەی تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز سودی لێوەربگیردرێت گرێبەستی (Buy-back) ە. چونکە بەهۆی ئەم گرێبەسستەوە ئیدی گشت سەرچاوە سروشتییە هایدرۆکاربۆنییەکانی نێو وڵات بە داخراوی دەمێننەوە و تەنها کۆمپانیای نەوتی نیشتیمانی (Kurdistan Oil Company: KOC) دەتوانێت گشت ئەرکەکانی پەرەپێدان و بەرهەمهێنان بگرێتە ئەستۆی خۆی.

بەپێی ئەم گرێبەستە، وەکو گرێبەستێکی ئەنجامدەر (Service Contract)، هەڵکەندنی گشت چاڵە نەوتی و گازیەکان بەگشت سەرمایەو پسپۆڕی شارەزاوە بە بەڵێندان بە قازانجێکی باش دەکەوێتە ئەستۆی کۆمپانیا بیانیە هاوردەکان.

لە پاشاندا بەرهەمهێنانی گشت کێڵگە فۆسیلیەکان و فرۆشتنیشی دەکەوێتە ئەستۆی کادیرانی ناوخۆیی واتە حکومەتی هەرێمی کوردستان. وە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت لە سەرمایەی فرۆشتنی بەرهەمی نەوت و گاز گشت کرێیی هەڵکەندنی کێڵگەکان و قازانجی بەڵێنپێدراو بدات بەو کۆمپانیا هاوردە بیانیانە.

ماوەی کار پێکردنی ئاوەها بەڵێنێک پێویستە تەنها بۆ ٤ تا ٥ ساڵە بێت تا پسپۆڕانی ناوخۆ بتوانن خویان پاشان ئەرکی هەڵکەندنی کێڵگە نەوتیەکان بگرنە ئەستۆی خۆیان.

هەربۆیەش بە پێچەوانەی بەڵێنی (PSA) لە بەڵێنی (Buy-back) دا کۆنترۆڵ کردنی سەرچاوەسروشتیە نەوتی و گازییەکان دەکەوێتە ئەستۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان نەک کۆمپانیایەکی بیانی. بۆ نمونە لە پاش سەرکوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و خومالی کردنی گشت سەرچاوە نەوتی و گازیە سروشتیەکان لەو وڵاتەدا تاکە ڕێگەی کارکردنی گشت کۆمپانیا بیانیەکان لەو وڵاتەدا تەنیا لە ڕێگەی گرێبەستی (Buy-back) وەیە، هەر ئەم هۆکارانەشە بۆتە هۆی پێشکەوتنی تەکنولۆجیای نەوتی ئێران لەو وڵاتەدا و ئامادەکاری زیاتری کادیرەکانی ئێران بۆ پەرەپێدانی گشت کێڵگەکانیان.

کەواتە بە پێی تێڕاوانینی مێژوویی هەرێمی کوردستان دەبێت کرۆکی ئیمزاکردنی هەر گرێبەستێک (چ Buy-back، چ

PSA، چ DPCs: Development and Production Contract یاخود چ :Risk Service Contract، RSCs) ئەوە بێت کە شانسی ئەوەی کە کادیرانی وڵاتەکەمان پێبگەن و لەو بوارەدا پسپۆڕببن، بەرەوسەرێ هەڵکشێت و سامانە سروشتییەکانمان بە فیرۆنەچن و تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوی نەوت وگازی سروشتی بهێنینە وڵاتمانەوە. هەروەها حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت بە سود وەگرتن لە سیاسەتی فیتۆ لەهەر گرێبەستێکدا (ئەگەر هەبێت) بە هۆی لیژنەی هەماهەنگی و سەرپەرشتیاری گرێبەستەکانەوە (Management Committee) بتوانێت سیاسەتی بەرێوەبردن و بوژاندنەوەی نەوت بەسەر سیاسەتی قازانجی کۆمپانیا نەوتیەکاندا زاڵ بکات.

سەرەتا گرنگترین خاڵ لە پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای هایدرۆکاربۆنیەکان ئەوەیە کە لە چوارچێوەی ئیمزاکردنی هەر گرێبەستێک دەبێت بیر لەوە بکرێتەوە کە کۆمەڵە شارەزایەکی بیانی بکەینە سێبەرێک لە نێو وێستگە پیترۆکیمیاویەکاندا کە بەهۆیانەوە کادیرەکانمان شارەزا بکەین تا لە داهاتویەکی نزیکدا خودی خۆمان بتوانین گشت کارەکانی دەرهێنان، پاڵاوتن، گواستنەوە و دابەشکردن بگرینە ئەستۆ.

سەرئەنجام بۆ سڕینەوەی سیاسەتی چەوتی ٨٠ ساڵەی گشت حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی ناوەندی لە بەغداد، کارێک بکەین کە بەهاوکاری هەمان کۆمپانیا بیانیەکان لە

نێو زانکۆکانماندا مەڵبەندی ئاکادیمی تەکنۆلۆجیای نەوت و گاز ببوژێنینەوە تا لە چەند ساڵێکی داهاتودا خودی خۆمان لە هەرێمی کوردستاندا پەرە بە تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی بدەین. چونکە مێژووی ئەم هەرێمەمان شایەتی ئەوە دەدات کە حکومەتی ناوەندی تەنانەت ڕێگەی نەدەدا کە قوتابیانی کوردستان لەو بوارانەودا پەرەبە خوێندن بدەن.

## ٥.١ کۆنفرانسێک بۆ بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی لە کوردستاندا

ئەنجامەکانی کۆنفرانسی جیهانی نەوت وگازی سروشتی لە هەرێمی کوردستاندا دەبێت لە ڕاستای دۆزینەوەی بەرنامەیەکی کارا بێت بۆ بوژاندنەوەی ئەم تەکنۆلۆجیایە لە هەرێمەکەماندا. لەو کۆنفرانسەدا دەبێت بە هاوکاری پسپۆڕانی دەرەکی هاوردە ماستەر پلانێک دابڕێژرێت کە چۆن ئێمە بتوانین لە هەرێمی کوردستاندا بە ڕێچەکەی پاراستنی ژینگە و بەفیڕۆنەدانی سەرمایە سروشتییەکانی نەوت وگازی سروشتی واتە بە چوستیەکی باش تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی بهێنینە نێو چوارچێوەی هەرێمی کوردستانەوە و کەڵک لە نوێترین تەکنۆلۆجیای پەرەپێدانی نەوت وگازی سروشتی وەربگرین. ئەو کۆنفرانسە بکرێتە خاڵی هێنانە ناوە و گوێزانەوەی زانیاری (Know-how) لە بواری تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاویدا بۆ نێو چوارچێوەی کاری حکومەتی هەرێمی کوردستان ( Transfer of technology).

بەگشتی ئەوە نزیکەی سەدساڵێکە کە نەوتی خاو لە چوارچێوەی جوگرافی وڵاتی ئەمڕۆی ئێراقدا دۆزراوەتەوە وپاشان هەنگاو بۆ هەڵهێنجانی درا، هێشتا زۆرتر لە ڕێژەی ٩٥% گشت دەرامەتی ساڵانەی وڵاتی ئێراق لەم سامانە

سروشتیەوە بەدەست دەکەوێت. کەواتە وڵاتی ئێراق بەگشتی و هەرێمی کوردستانیش بەتایبەتی بۆ وەدەستهێنانی سەرمایە تا دەیان ساڵی تر هەر پێویستی بە فرۆشتنی ئەم کانزایە و بەرهەمە بەنرخەکانی هەیە و واتە بەڕاشکاوی ئەم کانزایانە زامنکەرو تاکە دەرەتانن لە سەرەتادا بۆ بوژاندنەوەی ژێرخانی ئابوری وڵات و بۆ بەردەوامی هێزی سیاسی و سەقامگیری باری ئابوری هەرێمەکەمان.

بە هۆی کۆنترۆڵکردنی ئەم کانزایانەوە دەتوانین گشت سەرمایەوە پسپۆڕانی شارەزای بیانی بەرەو هەرێمەکەمان ڕابکێشین، چونکە تەکنۆلۆجیای گشت وڵاتانی سەرمایەداری پێشکەوتو تاسەر ئێسقان بەم کانزا سروشتییانەوە وابەستەن. واتە دەتوانین ئەم هۆکاری وابەستەیی یە بکینە داینەمۆی بوژاندنەوەی پیشەسازی هەرێمەکەمان. لە هێڵکاری خوارەودا ئەو بابەتە ڕچاو دەکرێت کە چۆن ساڵ لە دوای ساڵ بڕی پێویستی نەوتی دونیا بەرەوسەرێ هەڵدەگەڕێت.




هێڵکاری ٥.٧: بڕی پێویستی ساڵانەی نەوت لە بازاڕەکانی جیهاندا.

بڕی ئێستاکەی نەوتی بەرهەمهاتوی پێویست، خۆی لە نزیکەی Million B./d ٨٦ ملیۆن بەرمیل نەوت بۆ ڕۆژێک دەدات، واتە بڕی پێویستی ڕۆژانەی نەوت هەردەم لە هەڵکشاندایە [١٩]. هەربۆیەش پاش ڕونکردنەوەی ئەو پابەندیەی گشت تەکنۆلۆجیای جیهان بە نەوت، بانگێشە بۆ کۆنفرانسی نەوت وگازی سروشتی لە هەرێمەکەماندا لە لایەن گشت پسپۆڕان و کۆمپانیا گرنگە ناودارەکانی جیهان بە خاڵی لێکتێگەیشتن و خۆناساندنیان بە کاربەدەستانی ڕامیاری وڵات دەژمێردرێت.

چونکە لە هەرێمی کوردستاندا بوژاندنەوەی ئەم سەرچاوە سروشتیانە پێویستی بە تەکنۆلۆجیایەکی مۆدێرن و سەرمایەیەکی مەزن هەیە کە لەم بوارانەدا کۆمپانیا

مەزنەکانی نەوت وگازی سروشتی دەتوانن جێگەی خۆیان بکەنەوە.

کاربەدەستانی ڕامیاری وڵات دەتوانن لەو کۆنفرانسەدا بانگێشە بۆ ئەوە بکەن کە نەوتی کوردستان زۆر سوکە (API=35 - 40) هەربۆیەش دەتوانرێ زۆر بەئاسانی و خێرا بۆ مادەی سوتەمەنی (بەنزین) وەربگێڕدرێت وەهەروەها گازی سروشتیەکەشی زۆر شیرینە. کەواتە کەم کێڵگەی نەوتی و گازی سروشتی جیهانی هەیە کە ئەم تایبەتمەندییەی کێڵگە نەوتیەکانی کوردستانی هەبێت. وە هەروەها وەچنگ خستنی ئەم بەرهەمانە لە دۆخی سروشتییشدا پێویستی بە سەرمایەیەکی کەمترە لە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی تر.

لە و کۆنفرانسەدا دەتوانرێت ڕونبکرێتەوە کە هەرێمی کوردستان تاکە هەرێمێکە لە نێو ئەم گشت وڵاتەخاوەن نەوتانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە چاڵە نەوتی و گازی سروشتیەکانی بەدەستلێنەدراوی و پڕی مابێتەوە (جگە لە نەوتی دەڤەری کەرکوک). هەربۆیەش بەسەرنجەوە لەلایەن وڵاتە پیشەسازیەکانەوە دەوترێت کە نەوت و گازی سروشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە داهاتودا بۆ ئەوە هەڵدەهێنجرێت تا تونێتی وزەی وڵاتانی ڕۆژئاوای پیشەسازی بشکێنێ. کەواتە ئەم بابەتە دەتوانرێت بکرێتە خاڵی ڕاکێشانی گشت کۆمپانیا ناودارەکانی دونیای نەوت وگازی سروشتی بۆ نێو هەرێمی کوردستان.

لەو کۆنفرانسەدا دەتوانرێت مێژووی نەوت وگازی سروشتی لە هەرێمەکەماندا ڕونبکرێتەوە کە چۆن پاش سەدسالەی دەستبەسەراگرتنی نەوتی هەرێمی کوردستان لەلایەن حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی مەرکەزیەوە و ڕێگەیان گرت لەوەی کە تەکنۆلۆجیای هایدرۆکاربۆنەکان لە هەرێمی کوردستاندا پەرەبستێنێت، ڕێگەیان نەدا کادیرەکانمان شارەزاببن.

هەربۆیەش دەبێت کاربەدەستانی ڕامیاری وڵات لە کۆنفرانسەدا گرنگی بەوە بدەن کە چۆن لە بەرنامەی حکومەتەکەماندایە کە ئەم چوارچێوە ڕامیاریە بشکێنین و تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتی و پیترۆکیمیاوی بگەیەنینە کوردستان. دەبێت ئامانجی سیاسەتی کۆنفرانسەکە ئەوەبێت کە خودیخۆمان لە داهاتویەکی نزدیکدا لە هەرێمی کوردستانی خۆماندا وزەی پێویستی وڵات وەربگێڕین و بە هیچ دراوسێیەکمانەوە وابەستە نەبین واتە وزەکەمان هەڵقوڵاوی ئەم دەڤەرەبێت و نەبێتە هۆی پیسبونی ژنگەکەمان و نەکرێتە کارتێکی فشاری ڕامیاری لەلایەن دراوسێکانمانەوە.

دەبێت لەو کۆنفرانسەدا ڕونبکرێتەوە کە ئێمە خۆمان لە هەرێمی کوردستاندا کۆنترۆڵ کەری گشت سەرچاوە سروشتییەکانی گازی سروشتی ونەوتی خاوین. چونکە پاش ١٠٠ ساڵ بێبەش کردنمان لە سامانە سروشتییەکانی نێو هەرێمەکەمان ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان و

کۆمەڵانی خەڵکەکەی لە ئێراقی فیدراڵی نوێدا بەفەرمی خاوەنی سەرچاوەکانی وزەی کانزا فۆسیلیەکانیشن، بەتایبەتی نەوتیخاو لەگەڵ گازی سروشتی، هەربۆیەش دەبێت بانگێشە بۆ ئەوبکەین کە بۆ سەقامگیرکردنی ژێرخانی ئابوری سود لە گرانی ئەم وزانە لە پاش فرۆشتنیان لە نێو بازاڕەکانی دونیادا وەدەگیرین و توانای وەرگێرانی ئەم وزانە بۆ بەرهەمە پترۆکیمیاویەکان پەرەپێدەدەین و بە شێوەیەکی سەرەکی بە هاوکاری حکومەتی فیدراڵی ناوەندیی بەرهەمەکانی نەوتیخاو گازی سروشتی لە پاش وێستگە پیترۆکیمیاویەکاندا دەخەینە نێو بازاڕەکانی دونیاوە، نەک بەو ئامانجەی ئەم کانزایانە بە خاوی و لە دۆخی سروشتیدا بفرۆشرێن.

## ٥.٢ ئایا نەوتی‌خاو لە داهاتودا تاکە فاکتەری سەربەخۆیی کوردستانە؟

ئەوە ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە کە تا ئەمڕۆش بونی سامانە سروشتییەکانی نەوتی خاو، گازی سروشتی و ئاوی شیرین لە هەرێمی کوردستاندا فاکتەری کاولکاری و وێرانکاری هەرێمەکامان بووە، چونکە بیرۆکەی کلاسیکی داگیرکاری لە دابەشکردن و بەرتکەو زاڵبە دابووە تا بەهۆیەوە سامانە سروشتییەکان بەتالانببرێن. بەڵام بە گەشبینیەکی زۆرەوە لە داهاتویەکی نزیکدا لەبەر هۆکاری گرانی و نایابی ئاوی شیرین، نەوتی خاو و گازی سروشتی ئەم کانزایانە دەبنە هۆی فاکتەری سەقامگیری وە تا سەربەخۆیی کوردستان. چونکە بیرۆکەی ئەمڕۆی وڵاتە زلهێزەکان هێنانە کایەی ئاشتی و سەقامگیری لە ئەنجامی بچوک کردنەوەی دەوڵەتە گەورەکان دایە، تا بە توانایەکی زۆتر بڕێکی گەورەتری نەوت و گازی سروشتی بخەنە نێو بازاڕی وڵاتە پیشەسازی یەکانەوە تا تینۆتی پیشەسازی بە نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بشکێ. تەنها ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە لە سەرتاسەری جیهاندا بەهۆی زەخیرە بێشومارەکانیەوە کە ٦٥% گشت نەوت وگازی دونیای لەخۆگرتووە، پاش گۆڕینی ئەم چوارچێوە ڕامیاریەی ئێستا، توانای بەرهەمهێنانی بڕێکی زێدەتری نەوتی خاو گازی سروشتی لە توانای ئێستای دا هەیە.

هەر لەم بەشەدا لە پێگەی سیاسی ئەمڕۆی وڵاتی عێراق و هاتنەکایەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ڕوانگەی بەرهەمهێنانی نەوتی خاو و گازی سروشتی بۆ نێو هاوکێشە ڕامیاریە ئابوریەکانی دونیا و لە هەمانکاتیشدا لە گۆڕانکاری لە چوارچێوەی بەڕێوەبردنی وڵات بەهۆی هۆکارەکانی هەڵکشانی نرخی نەوتی خاو و گازی سروشتی دەکۆڵرێتەوە. لەم بابەتەدا سامانی نەوتی خاو و گازی سروشتی و زەخیرەی ئەم کانزایانە چەقی لێکدانەوەکەن.

سەرەتا لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩٢٠ کە بەریتانیا کۆنترۆڵی عێراقی گرتەدەست و لە ١٩٢١ دا بە فەرمی مەلیک فەیسەڵ کرا بە پاشای ئەو وڵاتە. هەبونی نەوتێکی زۆر لەم وڵاتەدا یەکێک بوو لەو هۆکارانەی کە وڵاتی بەریتانیای هێنایەسەر ئەو بیرۆکەیەی کە وڵاتی عێراق بخوڵقێنێت. کەواتە بونی نەوتی خاو سەرکیتین هۆکاری خولاقاندنی ئەم وڵاتە بووە، بەهەمان شێوەش هەبونی ئەم سەرمایە سروشتییانەی نەوتی خاو گازی سروشتی بونە هۆی خوڵقاندنی زۆربەی وڵاتەکان و میرنشینەکانی نێو کەنداوی فارسی.

چونکە تا چوارچێوەی ڕامیاری وڵات سادەتر و یاساکانی بەڕێوەبردنی وڵات سەرەتایتربن ئەوا گەیشتن بە سەرمایەکانی نەوتی خاو و گازی سروشتی لەلایەن کۆمپانیا زلهێزەکانەوە ئاسانترە. واتە لەنێو وڵاتە بچوکەکاندا کە ئەگەر خاوەنی زەخیرەی سەرچاوەسروشتییەکان بن، ئەوا

بەڕێوەبرن و دەرهێنانان و ناردەنەدەرەوەی نەوت و گازی سروشتی کاتێکی کەمتر و هەوڵێکی ڕامیاری سادەتری دەوێت لە بەراورد لەگەڵ کارکردن لە نێو ئەو وڵاتانەی کە خاوەنی یاسای ئاڵۆز و چوارچێوەی بەڕێوەبردنی بەرفراوانترن.

وڵاتەکانی کویەت، ئیماراتی عەرەبی و شاهنشینی بڕۆنای بەڵگەی حاشا هەڵنەگری ئەم ڕاستیەن کە چۆن سەرەڕای بچوکی چوارچێوەی جوگرافی ئەم وڵاتانە لەهەمان کاتیشدا توانایی دەرهێنان و ناردەنە دەرەوەی بڕێکی پێشوماری نەوت و گازی سروشتیان هەیە بۆ نێو بازاڕی وڵاتە پیشەسازیەکان و نزیکبونەوەی کۆمپانیا نەوتیەکان (IOC) بۆ کاری پەرەپێدان ئاسانترە لە چاو وڵاتێکی ڕامیاری ئاڵۆزی وەکو ئێران.

لە هەمانکاتیشدا نەوتیخاو و گازی سروشتی بە هۆی زەخیرەکردنی وزەیەکی زۆر و بەکارهێنانی لە گشت بوارێکی پیشەسازیدا و هەزارەها بەرهەمی تایبەتی بۆتە هۆی ناوزەدکردنی ئەم کانزایانە وەکو بەنرخترین کانزا لەسەر ڕویزەوی. لە دایەگرامی ٥.٨ دا بڕی وەزی پێویستی ڕۆژانەی جیهان دیاریکراوە، نەوتی خاو، گازی سروشتی و خەڵوزی بەردین, کە ئەمانە گشتیان وزەی نێو کانزا فۆسیلیەکانن، نزیکەی لە سەدا ٩٠% گشت وزەی پێویستی جیهانیان لەخۆگرتووە.




دایەگرامی ٥.٨: بڕی وزەی پێویست لە جیهاندا.

هەر ئەم هۆکاری پابەندیی جیهانی پیشەسازیە بە نەوتی خاو وایکردوە کە لە ساڵی ٢٠٠٥ وە ئیتر ڕۆژگاری هەرزانی نەوتیخاو بەیەکجارەکی لە چاڵ بنرێ.

لە ساڵی ٢٠٠٦ دا سەرەڕای ئەوەی کە گشت وڵاتەکانی ئۆپێک بە ئاخر توانای خۆیان نەوتیان دەنارده نێو بازاڕەکانی جیهانەوە بەڵام نرخی نەوتی خاو گەیشتە $ ٥٥ دۆلار بۆ هەر بەرمیلێک. بەڵام نرخی $ ١٣٠ دۆلار بۆ هەربەرمیلێک ئەو بابەتەیە کە دەبێت گشت وڵاتە

پیشەسازیەکان لەگەڵی بژین. نرخی گازی سروشتیش بەهەمان شێوە لە ژێر کاریگەری نرخی نەوتی خاو دا یەو و هەردەم شانبەشانی نەوتی خاو لە هەڵکشاندایە. کەواتە ئیستا بەرزی نرخی نەوتی خاو دیاردەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ نێو وڵاتانی پیشەسازی. تا ئەمڕۆش هیچ وزەیەکی دی نیە هاوشێوەی نەوت کە بەو شێوەیە وزەیەکی زۆری تێدا کۆکرابێتەوە و لە بواری گواستنەوەدا ئاوەها هەرزان و بەسود بێت. کەواتە لە داهاتوشدا لە بەر هۆکاری گەشە سەندنی توانای ئابوری وڵاتانی چین و هیندستان و بەڕازیل و کەمبونەوەی نەوتی خاو لە نێو چاڵەکانی زۆربەی وڵاتانی خاوەن نەوت هەر بەرەو سەرێ هەڵدەکشێ و نرخی $ ١٥٠ دۆلاریش بۆ هەر بەرمیلێک هەر هەرزانە. لە دایەگرامی ٥.٩ دا بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە چونێتی گەشەسەندنی کۆمەڵە وڵاتێکی زەبەلاحی ئابوری جیهان لە ماوەی سێ ساڵدا خراوەتە ڕوو.

کەواتە تاکە دەرەتانی وڵاتە پیشەسازیەکان ئەوەیە کە بڕی هێنانە ناوەی نەوتی خاو بو نێو بازارەکانی دونیا بەرەو سەرێ بەرن و چاویشیان هەر لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە، وە بۆ گەیشتن بەم مەرامە دەبێت سیستمە ئالۆزە ڕامیاریەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لێکهەڵوەشێن.




دایەگرامی ٥.٩: توانای گەشە سەندنی ئابوری
کۆمەڵە وڵاتێکی جیهان [٢١]

لە ساڵی ٢٠٠٦ دا سەرەڕای ئەوەی کە گشت وڵاتەکانی ئۆپێک بە ئاخر توانای خۆیان نەوتیان دەناردە نێو بازاڕەکانی جیهانەوە بەڵام نرخی نەوتی خاو هەر بەگرانی مایەوە، چونکە توانای دەرهێنانی زۆربەی وڵاتەکانی نێو ئۆرگانی ئۆپێک و وڵاتەکانی تری دەرەوەی ئۆپێک دیاری کراوە، بۆیە تاکە دەرەتانی ڕزگار بونی ئەم وڵاتە پیشەسازیانە لەم گێژاوی وزەیەدا لەتکردن و پارچە پارچەکردنی ئەو وڵاتانەیە وەکو ئێراق کە خاوەنی بڕێکی زۆری زەخیرەکانی نەوت و گازی سروشتین.

هەر بۆیەش لێکهەڵوەشانی ئێراق لە وڵاتێکی مەرکەزیەوە بۆ چەند هەرێمێکی سەقامگیر تا سەر بە خۆ ئاشکارا ترین هەنگاوی ئەو ڕامیاریەیە، بە دڵنیایشەوە مەزەندەدەکرێت کەلە داهاتوشدا ئەم شالاوە وڵاتی ئێرانی دراوسێیشمان بگرێتەوە.

وەئێمەی کوردیش تاکە زیانلێکراوی ئەم چوارچێوە سنورە دروستکراوە دەستکردانەین و بە دڵنیایشەو خاوەنی گەورەترین بڕی زەخیرەی نەوت وگازی سروشتیشین لەم دەڤەرەدا. ئەگەر وڵاتی ئێراق تا ئەمڕۆش لە کاتی خوڵقاندنیەوە نزیکەی ٣ ملیۆن بەرمیل نەوتی خاو لە ڕۆژێکدا تاکە ترۆپی بەرهەمهێنانی نەوت و بڕی ناردنەدەرەوەی بوبێت، ئەوا ئێمە لەهەرێمی کوردستاندا دەتوانین بەتەنیا لە چەند ساڵیکی داهاتودا لە پاش پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای هایدرۆکاربۆنیەکان ئەو بڕە بنێرینە نێو بازاڕەکانی دونیاوە، بەهەمان شێوەش بە مەزەندنی خۆم هەرێمی خوڵقاوی باشوری دەڤەری بەسرەش لە پاش بوژاندنەوە و مۆدێرنیزەکردنی تەکنۆلۆجیاکەی توانایی ناردنەدەرەوەی زیاتر لە ٥ ملێون بەرمیل نەوتی لە ڕۆژێکدا دەبێت، و ناوەڕاستی ئێراقیش بەهەمان شێوە. واتە بە هۆی هەڵوەشاندنی ئەم وڵاتە توانرا بڕی ناردنەدەرەوی نەوت و گازی سروشتی ئەم وڵاتە ٥ بەرابەر بەرەوسەرێ ببرێت.

لە هەمانکاتیشدا تا ئەمڕۆکەش نە خولْقاندنی وڵاتی عێراق و نە خاوەنداریێتی نەوتەکەی بونەتە سیمبۆلی ئاشتی و ئاسایش بۆ ئەو وڵاتە بەگشتی. بەتایبەتی هەرێمی کوردستانی خۆشمان لە بەر بیرۆکەی شۆڤێنی داگیرکاری ڕۆژ لەداوی ڕۆژ لە چوارچێوەی ئەم یەکگرتنە خۆنەویستەشدا کاولکراوە و ژێرخانی ئابوریەکەی شێویێندراوە. بەڵام ئەم بیرۆکەی هەرێمایەتیە تاکە هۆکاری سەقامگیری سیاسی و ئابوری ئەم وڵاتە دەبێت لە ئایندەدا.

سەرئەنجام دەتوانین ئەوەبڵێین کە کاتی ئەوە هاتووە کە بەهۆی سیاسەتی ڕاستی حکومەتی هەرێمی کوردستان سود لەم زەخیرە نیشتیمانیانە وەربگرین و ژێرخانی ئابوری وڵاتمان سەقامگیر بکەین وە لەهەمانکاتیشدا قورسایی سیاسی خۆمان لە ناوچەکەو جیهاندا بسەپێنین.

## ٥.٣ گرفتەکانی بوژاندنەوەی تەکنۆلۆجیای نەوت لە هەرێمی کوردستاندا

هەر تەکنۆلۆجیایەک و بوارێکی پیشەسازی لایەنی ئەرێنی و نێگەتیڤی تێدایە لەئەم بابەتەدا بەهۆی ئەم خاڵانەی خوارەوە بابزانین لایەنە گرنگەکانی پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتی بۆ هەرێمەکەمان چین.

١. سەرەتا هێنانەناوەی سەرمایەیەکی باش کە ئەمەش نزیکەی ٩٥% بوجەی گشتی‌یە پاش ناردنی بۆ دەرەوەی وڵات، بەتایبەتی بۆ ئەو وڵاتانەی کە هەنگاو بەرەو پێشچون دەنێن وەکو لە نێوانیاندا ئێراق/ هەرێمی کوردستانیش دەگرێتەوە.

٢. پاشان دەبێتە بوژاندنەوەی سەرمایەی بانکی بەهۆی وەرگرتنی پارەی خاوەندارێتی (Royalty) و (signature Bonuses and other Bonuses, capacity Building, Rental payments باج وەهەروەها ئەوبەخشانەی کە بە فەرمی لە کاتی هاتنەناوەی کۆمپانیای کانی نەوت وگازی سروشتی وەردەگیرێن.

٣. گازی سروشتی دەتوانرێت بۆ وەرگێڕان وزە (بەتایبەتی وەرگێڕانی وزەی کارەبا و گەرمی نێومالان، تەنانەت لە بواری هاتووچۆشدا) جێگەی گشت بەرهەمەکانی تری نەوتی خاو بگرێتەوە،

ئەوانەی لەکاتی سوتاندنیاندا ژینگە بەرەو شڵەژان پۆخەڵی دەبەن.

٤. تەکنۆلۆجیای نەوت دەبێتە داینەمۆی خولقێنەری ئیش بۆ هاولاتیان وەهەروەها داینەمۆی وەگەرخستنی زۆربەی کەرتەکانی تری پێویستی ئابوریە لە ولاتدا، چونکە بۆ دروستکردنی وێستگە نەوتیەکان پێویستیمان بە گشت بوارەکانی تەکنۆلۆجیای ڕۆژ هەیە.

٥. بوژاندنەوی تەکنۆلۆجیای نەوت دەبێتەهۆی جوڵەی بازار و پەرەپێدانی گواستنەوە و هاتوچۆی کالا لە بازاڕدا.

بەڵام لە هەمانکاتیشدا کۆمەڵە گرفتێک هەن کە لە کاتی پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای نەوت وگازی سروشتی ئاوقەمان دەبێت. ئەم گرفتانە بەشێکی زۆر ئەو لاتانەی گرتۆتەوە کە خاوەنی نەوتن و بەبێ بەرنامە ئابوری ولاتەکەیان توشتی پەتای فرۆشتنی نەوت وبەرهەمەکانی کردوە، واتە پاش دامرکانی گشت لایەنە پیشەسازیەکانی تر، ئابوری ولاتیان ١٠٠% بەستۆتەوە بە فرۆشتنی نەوتی خاوەوە.

١. گرفتی گۆڕانکاری و کێشە بۆ ژینگەی ولات بەتایبەتی بۆ گشت گیانداران و سەوزایی لەو ناوچانەی کە لە کێڵگە پەرەپێدراوەکاندا نەوت و گازی سروشتی نزیکە و لێی بەرهەم دەهێنرێت.

٢. هۆکاری سوتاندن و بەرهەمهێنانی نەوت وگازی سروشتی دەبێتە هۆی گەرم هەڵگەڕانی پلەی گەرمای زەوی (Greenhouse gases) و کێشەی سوتاندنی گازی سروشتی لە مەشغەڵەکانی نێو وێستگە هایدرۆکاربۆنیەکاندا.

٣. هاتنەناوەی سەرمایەیکی دەبێتە هۆی هەڵگەڕانی ئابوری وڵات و هەڵئاوسانی درواى خۆماڵی و کاریگەری زیاتری دراوی بیانی ($) بە سەر ئابوری وڵات، پەتای هۆڵەندی (Dutch disease) ئەو گرفتەیە کە هۆڵەندیەکان توشی هاتون و چارەسەریان بۆ دۆزییەوە.

٤. گرانبونی نرخی کاڵاکان، خولقاندنی تەمەڵی بە هۆی هاتنەناوەی پارەیەکی زۆر کە ئابوری وڵات و بازاڕ پێی هەزم نەکرێت.

٥. واستەو واستەکاری و دەستخستنە ناوکاری تەندەربازی و تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز و سەرهەڵدانی گەندەڵی لەلایەن کاربەدەستانی ڕامیاری وڵات و گرێدانی ئەم تەکنۆلۆجیایە بە لایەنە ئابوریەکانی تری وڵات.

٦. دابەزینی ئاستی زانیاری دانیشتوانی ناوچەکان، هەڵقولانی گرفتی ناوچەگەرێتی و بەلای سامانی سروشتی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، بۆ

نمونە شاری کەرکوک بەهۆی زۆری سامانی سروشتی لەو شارەدا هەزاران گرفتی ڕامیاری و ناوچەگەرێتی و ڕەگەزپەرستی توشی دانیشتوانەکەی بووە.

**چۆن دەتوانین خۆمان و ئابوری وڵاتەکەمان لەم گشت گرفتانە بپارێزین.**

**سەرەتا ڕونکردنەوە لە بواری ژینگەدا:**

کۆمپانیایاکانی بواری نەوت و گازی سروشتی دەبێت زیاتر خۆیان هەست بە بەرپرسیاری بەرانبەر بەژینگەی وڵات بکەن و کاربەداستانی ڕامیاری وڵاتیش بە هۆی پارلەمانتەوە بە هۆی دانانی یاسای تایبەت بە پارێزگای لە ژینگە و بوژاندنەوەی ڕێگە لە بەفیڕۆ سوتاندنی گازی سروشتی و فڕیدانی نەوتی خاو، بەرهەمەکانییەوە لە نێو وێستگەکان بگرن. هەروەها پێویستە گشت یاساو ستاندردەکانی جیهان بۆ پارێزگاری ژینگە لە بواری سودلێوەرگرتنی تەکنۆلۆجیای نەوت وگازی سروشتیدا بە شێوەیەکی فەرمی لە کوردستاندا کاری پێبکرێت و ببێتە ڕێڕەوی کاری گشت کۆمپانیاکانی بواری نەوت گازی سروشتی بەبێ گوێدانە هەر ناوچەگەریەک.

پەرەپێدان بە تەکنۆلۆجیای پێشکەوتو بۆ بردنەسەری چوستی گشت ئەو ئامێرانەی کە لە بواری نەوت و گازی سروشیدا سودیان لێوەدەگیرێت، کە ئەمەش کاری لیژنەی

سەرپەرەشتی گشت گرێبەستەنەوتیەکانی نێو کوردستانە. پاشان لە ڕێی سنورەکانەوە ڕێگەگرتن لە هێنانە ناوەی کەرەسەو ئامێرەکۆنەکانی بواری نەوت و گاز کە چوستیەکەیان دابەزیبێت، کارێکی زۆر گرنگە.

پەرەپێدانی شەبکەی (Network) مۆدێرنی سەرتاسەری بۆ گواستنەوەی نەوت وگازی سروشتی و گشت بەرهەمەکانیان بەهۆی بۆری تایبەتیەوە (Pipeline) بۆ نێو کارگەو ماڵی هاوڵاتیان. تا ڕێگە لەو تەنکەر و بۆریانە بگیرێت کە بەسەر چوار تایەوەن کە ئەمڕۆ بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ گواستنەوەی نەوت وبەرهەمەکان سودیان لێوەدەگیرێت و جگە لە پیسکردنی ژینگەی وڵات کاری هاتوچۆیان لە سەر شەقامەگشتیەکانی هەرێم ترسناک کردووە.

## چارەسەری نەخۆشی و کێشەو پەتای هۆڵەندی:

ڕێگەنەدان بە هێنانەناوەی سەرەمایەی زۆر، ئەو برە زۆرەی کە نەتوانرێت لەلایەن ئابوری کوردستانەوە هەزم بکرێت. لە هەمانکاتدا دەتوانرێت ئەو برە پارەیە بۆ نەوکانی داهاتو دابنرێت، ئەوانەی کە لە داهاتودا دێنەسەر چاڵە نەوتە خاڵیەکان (Fund for future Generation)

## ئەرکەکانی پەرلەمان و حکومەتی خۆجێی:

١. دانانی یاسای تۆکمە بۆ پاراستنی مافی هاولاتیان

٢. دانانی یاسای تۆکمەی نەهێشتنی گەندەڵی و شەفافیەت لە گشت کاری کۆمپانیاکان.

٣. پەرەپێدان بە بەرهەمی خۆماڵی و خودکەفاکردنی گشت بەرهەمە پێویستەکانی پیشەسازی بەتایبەتی ئەو ئامێرانەی کە لە بواری پیشەسازی نەوت وگازی سروشتیدا پێویستن. لە سەروی ئەمانەوە پەرەپێدانی گارگەی توانەوەی ئاسن و مس.

٤. بە هۆی پەیمانگاو زانکۆکانمانەوە پەرەپێدانی سامانی مرۆڤی پێشکەوتو بکینە ئامانجێکی گرنگ واتە ئەوکادیرە مامناوەندنی وبالایانەی کە هەڵسوڕێنەری وێستگەکانی نەوت وگازی سروشتین با لە ناوچەکەی خۆمانەوە هاتبن.

بوژاندنەوەی پەیمانگاو زانکۆی تایبەتی بۆ کاری لێکۆڵینەوە و پەرەپێدان (R&D) بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی باشترو هەرزانتر و لەبارتر لە بەر ڕۆشنای پارێزگاری ژینگەی کوردستان بۆ هەرچی پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای نەوت و گازی سروشتی لە کوردستاندا.

## ٥.٤ بۆری گازی سروشتی نابۆکۆ و دەرفەتێکی باش بۆ هەرێمەکەمان

ئەوروپاییەکان بە شێوەیەکی گشتی خاوەنی سەرچاوەسروشتییەکانی گازی سروشتی نین و ئەو بڕەی کە هەشیانە بەشی گشت پێداویستیەکانی ناوخۆ و پیشەسازی‌یان ناکات، بۆیە ڕۆژانە بە بلیۆن مەتر سێجا گازی سروشتی لە دەرەوە هاوردەدەکەن، وڵاتی ڕوسیا بەگشتی زۆربەی گازی سروشتی ڕۆژانەی ئەوروپا دابیندەکات، کەواتە تەکنۆلۆجیای ئەوروپا و پێداویستی ڕۆژانەی هاوڵاتیانیان تاسەر ئێسقان بە گازی سروشتی ئەو وڵاتەوە پابەندە، ئەم پابەندیەش ڕۆژانە ئاسایشی گشتی، ئاسایشی نەتەوەیی و گشت بڕیارە ڕامیاریەکانی وڵاتە ئەورپاییەکان بەگشتی لە ئاست سیاسەتی ڕوسیادا دەخاتە ژێر پرسیارەوە و بەکورتی ئەم کۆمەڵە وڵاتە پیشەسازیە گرنگەی جیهان ڕۆژانە لە ژێر فشاری بەچەککردنی وزەن لەلایەن ڕوسیاوەو لە ڕوبەڕوبونەوی ڕوسیادا خاوەنی بڕیاری سیاسی بێلایەنی خۆیان نین.

بۆ کەمکردنەوەی ئەم گشت فشارانە ئەوروپاییەکان بەدوای سەرچاوەی گرنگی سامانی سروشتی دیکەدا بەتایبەتی گازی سروشتی دەگەڕین.

یەکێک لەو پڕۆژانەی کە بتوانێت ئەڵتەرناتیڤێکی تر بۆ دابینکردنی وزەی ڕۆژانەی ئەوروپاییەکان بێت تانها پڕۆژەی نابۆکۆیە. ئێران بە هۆی سیاسەتی ئاشکرایانەوە ناتوانێت لەم بوارەدا لە بری ڕوسیا دەورببینێت. تاکە وڵاتێک کە بتوانێت گازی سروشتی زیاد لە خۆی بۆ ئەم پڕۆژەیە دابینبکات و هیچ گرفتێکی ڕامیاری لەگەڵ سیاسەتی گشتی ئەورپاییەکاندا نەبێت تەنها وڵاتی ئێراقە بە گشتی و هەرێمی کوردستانە بەتابەتی.

نابۆکۆ پڕۆژەی بۆریەکی گازی سروشتییە کە درێژیەکەی نزیکەی KM ٣٥٠٠ دەبێت و بەهۆیەوە سەرچاوە سروشتییەکانی گازی سروشتی لە ناوچەی دەریای خەزەر (دەریای کاسپ) وە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست (ئێراق/ مسر) بە بازارەکانی وزەی ئەوروپا دەبەستێتەوە. ئەم بۆریە بە تیرەی"٥٦ ئینج واتە (١.٤ مەتر) بە درێژایی KM ٢٠٠٠ بە نێو وڵاتی توركیا و وڵاتە ئەوروپای‌یەكانی بۆلغاریا بە درێژی KM ٤٠٠، ڕۆمانیا بەدرێژی KM ٤٦٠، هەنگاریا بەدرێژی KM ٣٩٠ پاشان بەدرێژی KM ٤٦ دەكەوێتە نێو وڵاتی نەمساوە، واتە باشوری ئەوروپا وە لەوێشەوە دەتوانرێت بە هۆی هێڵی بۆری گشتی ( European Pipeline Network) گازە سروشتی دەگەیەنێتە نێو گشت بازارەكانی ئەوربای ناوەڕاست و ڕۆژئاوا. لە هێڵكاری خوارەوەدا چوارچێوەی پڕۆژەكە دەستنیشانكراوە.




هێڵکاری ٥.١٠: بۆری گازی سروشتی نابۆکۆ و ئەو وڵاتانەی کە بەشدارن

بیرۆکەی ئەم پڕۆژەیە کە بڕی پارەی تێچوو نزیکەی ٨ ملیارد دۆلاری بۆ تەرخانکراوە لە ساڵی ٢٠٠٢ دا دەستی پێکرد و چووە قۆناغێ جێبەجێکردنەوە و لە ساڵێ ٢٠١١ دا بڕیاربوو بچێتە قۆناغی ئیشکردنەوە و لە ساڵی ٢٠١٤ دا گازی سروشتی بگەیەنرێتە نێو بازاڕەکانی ئەوروپا، بەڵام لە بەر نەدۆزینەوەی سەرچاوەی گازی سروشتی و داواکەوتنی گرێبەستی خستنەناوەی گازی سروشتی لە لایەن وڵاتەکانی خاوەنی سەرچاوەی سروشتی گازوە بۆ نێو بۆریەکان قۆناغی ئیشپێکردنی ئەم پڕۆژەیە دواخرا بۆ ساڵێ ٢٠١٤.

ڕەنگە لە بەر ئیمزانەکردنی گرێبەستی دابینکردنی گازی سروشتی پێویست تا ئەم بەرواره بۆ پرۆژەکە کاتی بەگەڕخستنی ئەم پرۆژەیە بۆ ساڵەکانی ٢٠١٦ش دوابخرێت.

ئەم بۆریە دیزاین کراوە بۆ گوێزانەوەی بڕی bcm/year ٣ ، کۆمەڵە کۆمپانیایەکی بواری وزە (نەوت، گازی سروشتی و کارەبا) وەکو (RWE) لە وڵاتی ئەڵمانیا، (OMV) لە وڵاتی نەمسا و (MOL) لە وڵاتی هەنگاریا و کۆمەڵە کۆمپانیایەکی ئەوروپای ڕۆژهەڵات پاڵپشتی ئەم پرۆژەیە دەکەن و بۆ ئەم مەبەستە کۆمپانیای نابۆکۆ بۆ ڕاپەڕاندن و جیبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە خوڵقاوە، ئەم کۆمپانیایە ( Nabuco Gas Pipeline International GmbH)، هەڵدەستێت بە ڕاکێشان و بەستن و ئامادەکردنی ئەم بۆریە تا نێو بازاڕەکانی ئەوروپا.
ئەم پرۆژەیە لە بنەڕەتدا بۆ هێنانەدی ئەم چەند خاڵە ستراتیژیەی خوارەوە دانراوە:

١. کردنەوەی لولەیەکی نوێ بۆ گەیاندنی گازی سروشتی لە نێو کێڵگەو و سەرچاوەکانی سامانی سروشتیەوە بۆ نێو بازاڕەکانی ئەوروپا

٢. گەیاندن و دابەشکردنی سامانی گازی سروشتی بە نێو ئەولاتانەدا کە بۆرییەکە بە نێویاندا تێدەپەڕێت و پێویستیان بەو سامانە سروشتییە هەیە.

٣. بەزرکردنەوەی شانسی گەیاندنی گازی سروشتی و کەمکردنەوەی فشاری سیاسی وزە لە لایەن ڕوسیاوە بۆ سەر بازاڕەکانی وزەی ئەوروپا.

٤. بردنەسەرەوەی بڕی سودلێوەرگرتنی گازی سروشتی لە گشت بوارەکانی تری پیشەسازی و خزمەتگوزری هاوولاتیاندا.

هەرێمی کوردستان بەتایبەتی ولاتی ئێراق بەگشتی پشکێکی گەورەی لە سەرکەوتنی ئەم پڕۆژەیەدا دەکەوێتە ئەستۆ، ئەمە هەلێکی زێڕینی باشە کە بتوانین ئێمە لە هەرێمی کوردستاندا سەرچاوەی سامانە سروشتییەکانمان بە بازاڕەکانی وزەی ئەوروپاوە گرێبدەین. بێگومان دەتوانرێت لە کێڵگەکانی هەرێمەکەماندا زۆر زیاتر لە بڕی سامانی سروشتی گاز بۆ پێداویستیەکانی ناوخۆ بەرهەمبهێنین.

دەکرێت بەهۆی سودوەرگرتن لە زانیاری ئەو کۆمپانیایانە کە بەشدارن لە ڕاپەڕاندنی ئەم پڕۆژەیەدا، پاش دۆزینەوەی هەلی باش بۆ کارکردن لە بواری پێشکەوتوی گازی سروشتیدا، ئاستی زانیاری ئەندازیارانی هەرێمی کوردستان

بەتایبەتی لە بواری گازی سروشتیدا بەرەوسەربەرین و گازی سروشتی بکەینە یەکێک لە هەرە وزە بەسودەکانی هەرێمی کوردستان لە گشت بوارەکانی پیشەسازی و خزمەتگوزاری هاوولاتیان و گازی سروشتی بگەینینە گشت کونجو کەلەبەرێکی ئەم نیشتیمانەی خۆمان وە هەروەها هەر هاوکاریەکی ئەم پڕۆژەیە و سەرکەوتنی بکەینە مەرج بۆ گەیشتمان بەو چەند خاڵەی سەرەوە.

واتە سەرەتا گشت پێداویستیەکانی ناوخۆی ولاتی خۆمان دابینبکەین و پاشان بیر لە ناردنەدەرەوی بەشی زیادەی ئەو سامانە بکەینەوە.

مەبەستی تورکیا لە بەشداری ئەم پڕۆژەیەدا تەنها بۆ دابینکرنی وزەی وڵات و دۆزینەوەی سەرچاوەی گازی سروشتییە بۆ نێو پیشەسازی وڵاتەکەی تا مەبەستی ڕێگەدان بەو سامانە بۆ نێو بازاڕەکانی ئەوروپا. زۆربەی زۆری وڵاتەکانی ئەورپای ڕۆژهەڵات هەمان مەبەستی تورکیایان هەیە سەرەتا دابینکردنی گازی پێویست بۆ پیشەسازی وڵاتەکەیان و پاشان ڕیگەدان بەو سامانە تابڕوات بۆ نێو بازاڕەکانی ئەوروپا.

گرنگی ئێراق و هەرێمی کوردستان بۆ سەرکەوتنی ئەم پڕۆژەیە لەوەدایە کە ئەم وڵاتە بەهۆی سەرچاوەکانی زۆری گازی سروشتی توانایی دابینکردنی بڕێکی باشی گازی سروشتی هەیە بۆ ئەم پڕۆژەیە. بەستنەوەی سەرچاوەی سامانی گازی سروشتی هەرێمی کوردستان بە بازاڕەکانی پیشەسازی ئەوروپا مەزنترین و زێڕینترین دەرفەتی سیاسی و ئابوریە کە تائێستا لە ئەجندای هەرێمەکەماندا بوبێت، هەربۆیەش دانانی تیمێکی دور لەگەندەڵی و شارەزا لە هەرێمەکەماندا بۆ ڕاپەڕاندان و گەڵاڵەکردنی گشت پێداویستیەکانی سەرکەوتنی ئەم پرۆژەیە دەبێت لە ئێستاوە بکرێتە بەرنامەی کاری حکومەتی هەرێمی کوردستان.

دەبێت کاری تیمی شارەزای ئێمەو ئالییەتی دابینکراو لە هەرێمدا بۆ ئەو ستراتیجیەتەبێت کە ئەم پڕۆژەیە سەرکەوتوبێت لە کارەکانیدا.

## ٦. تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی

سەرەتا پیترۆکیمیاویی بە کیمیایی گشت پێکهاتەکانی نێو وزە فۆسیلیەسەرەتاییەکان یاخود هایدرۆکاربۆنەکان (نەوتی خاو، گازی سروشتی، خەڵوزی بەردین، خەڵوزی قاوەیی و خەڵوزی ڕەش) پێناسە دەکرێت. گشت ئەم پێکهاتانەی نێو نەوتی خاو لەگەڵ گازی سروشتی لە پەیوەندیەکانی نێوان هایدرۆجین و کاربۆن (H-C) پێکدێن. بواری کاری تەکنۆلۆجیایی پیترۆکیمیاویی (Petrochemical Industry) پاکژکردنەوە (Purification)، وەرگێڕان ( Conversion and Generation) و لێکدابڕان (Cracking Thermal) و هەڵوەشاندنی ئەم پەیوەندیانەیە بۆ وەچنگخستنی هەزارەها (بەرهەمی نوێ) پەیوەندی کاربۆن و هایدرۆجینی تر کە هەر بەرهەمێک خاوەنی کۆمەڵێکی دیاری کاربۆن ( C1 to Cnn ) و هایدرۆجینە.




وێنەی ٦.١: وێستگەیەكی پیترۆكیمیاویی و گشت پێكهاتەكانی

بۆ پەرەپێدان بە تەكنۆلۆجیای پیترۆكیمیاوی پێویستە لە نێوان گشت وزەسەرەتاییەكاندا وزەیەك هەڵبژێردرێت كە لە داهاتوشدا جوابگۆی گشت خواستەكانمان بێت و لە ڕاستای هێشتنەوەی ژینگەی پاكی كوردستان بێت.

كەواتە تا ئەو ڕۆژەی كە گشت وزەی پێویستی هەرێمی كوردستان لە وەرگێڕانی وزەی وزەنوێبوەكان ( Renewable Energy وزەی تیشكی خۆر Solar energy، ووزەیبا Wind energy، وزەی ئاو Hydro power ) بەرهەم بهێنرێت، كە ئەم بیرۆكەیە دەبێت لە داهاتودا ڕاستای سیاسەتی دابینكردنی وزەی هەرێمی كوردستان بێت، ئەوا دەبێت بە ناچاری

چوارچێوەی وزەی هەرێمی کوردستان لەسەر وەرگێڕانی وزەی کانزافۆسیلیەکان (بەتایبەتی نەوت و گازی سروشتی) سەقامگیربکرێت.

لەم بابەتەدا بیر لە هەڵبژاردنی یەکێک لە وزەکانی نێو کانزافۆسیلیەکان دەکرێتەوە. چونکە ئاشکرایە کە زیادتر لە ٨٥ % گشت وزە سەرەتاییەکان کە ساڵانە لەلایەن مرۆڤەوە لەسەر ڕوی زەوی بۆ سوتاندن سودیان لێوەر دەگیردرێت لە مادە فۆسیلیەکانەوە دێن. وەکو خەڵوزی بەردین، نەوتی خاو و گازی سروشتی. لە دایەگرامی خوارەوەدا ٦.٢ وزەی وەرگێڕدراوی سەرتاسەری جیهان ڕونکراوەتەوە. لەو هاوکێشەیەی وزەوەرگێڕاندا ساڵ لە دوای ساڵ ڕێژەی سودلێوەرگرتنی گازی سروشتی بۆ وەرگێڕانی وزە لە هەڵکشاندایە و لە چەند ساڵێکی داهاتودا، لە بەر هۆکاری پاراستنی ژینگە و توانای باشی وەرگێران و سوتاندی، جێگەی نەوتی خاو دەگرێتەوە. بە تایبەتی لە بواری وەرگێڕانی وزەی کارەبادا لە نێو وێستگەی هەڵم و گازی سروشتی combined Cycle بەهۆی بەرزی چوستیەکانیانەوە high efficincy تەنها سود لە گازی سروشتی وەردەگیردرێت.




٦.٢: ڕێژەی وزەی وەرگێڕداروی پێویستی دونیا

بڕهاتوویی ئەم مادە فۆسیلیانە لەوەدایە کە ئەها ڕۆژێ دێ کە کۆتاییان دێت. جگە لە کۆتای هاتنیشیان بەهۆی پاشماوەی گازی سوتاندنیانەوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژینگەکەمان بەرەو پیسی و شڵەژاندن دەبەن، لە هۆکارە نەخوازراوەکان شڵەژاندنی کەش و هەوا، مردنی دارستانەکان و ژەنگی بەردو ئاسنە بە هۆی ترشی بارانیەوە ( H2SO4 ). کەواتە دەبێ یان سودوەرگرتن لەم مادە فۆسیلیانە کەم بکرێتەوە یان ڕوو لە وزەیەکی تر بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی هاوڵاتیان بکرێتەوە کە هەمان خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان دابینبکات و ژینگەش لە ئەنجامی

وزەگۆڕکێکەیەوە نەشڵەژێت. سەرەڕای ئەوەی کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دانیشتوانی وڵات زۆر دەبێ و ئاستی ژیانیشیان لە سایەی ئارامی هەرێمی کوردستانەوە بەرەو باشی دەڕوات ئەوا پێویستیمان بە وزەیەکی زۆرتر دەبێ لە بەراورد لەگەڵ ڕۆژانی ڕابوردوو.

ئەگەر بە سیاسەتێکی ڕاست لەم هاوکێشانەی سەرەوە نەکۆڵینەوە ئەوا لە داهاتودا گێژاوی دابینکردنی وزەو پاراستنی ژینگە وەکو زۆربەی وڵاتانی دی دونیا بەرۆکمان دەگرێت.

لە هێڵکاری خوارەودا ٦.٣ دا ماوەی بەرگەگرتنی گشت وزەسەرەتاییەکانی دی ڕونکراوەتەوە. بەڕاشکاوی بەهۆی نەبونی کانزاکانی خەڵوزی بەردین و پاشماوەی پیسی ئەوکانزایە بۆ ژینگەو باری ناهەمواری سیاسی و پاشماوەی ئەهریمەنی پڕتیشکی وزەی ئەتۆمی، پاش کرداری وزەوەرگێڕان، تەنها گازی سروشتیە کە بتوانین تا داهاتویەکی دور چوارچێوەی وزە و تەلکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی خۆمانی لە هەرێمی کوردستاندا لەسەر بونیاد بنێین. چونکە نەوتی خاو لە بەر بڕبەهابونی بەگشتی لە بواری گواستنەوە و فرۆشتن بۆ وەچنگخستنی سەرمایە بۆ سەقامگیرکردنی ژێرخانی ئابوری هەرێمی کوردستان سودی تایبەتی خۆی دەگەیەنێت.




هێڵکاری ٦.٣: ماوەی بەرگەگرتنی کانزافۆسیلیەکانی ڕوی زەوی[١١]

لە پەراوێزی ئەم ڕاستیانەدا کەواتە تاکە وزەیەك کە لە چاو وزەکانی تردا نەبێتە هۆی پۆخەڵیی ژینگە و لە هەرێمەکەی خۆماندا بەشێوەیەکی پاش بونی هەبێت و تا

چەند سەد ساڵێکی داهاتو بەرگە دەگرێت تەنها وزەی سەرەتایی گازی سروشتییە. چونکە لە ڕاستای دارشتنی سیاسەتی وزەدا دەبێت ئێمە وزەیەک بۆ دابینکردنی وزەی دواڕۆژی وڵاتەکەمان هەڵبژێرین کە خۆماڵی بێت و بەهۆیەوە وابەستە نەبین بە هیچ یەک لە دراوسێکانمانەوە، چونکە فشاری ڕامیاری بەهۆی وزەوە ئەو بابەتە بەڵگە نەویستەیە کە ڕۆژانە لەلایەن زۆربەی زلهێزەکانی دونیاوە پڕاکتیزە دەکرێت. بۆ نمونە قەیرانەکانی دونیای ووزە لە ساڵەکانی ١٩٧٣، ١٩٧٩ و ئێستاکەش گوشاری ڕامیاری وڵاتی ڕوسیا بۆ سەر زۆربەی دراوسێکانی و لەم دەقەرەی خۆماندا شەڕی هێزی هاوپەیمانان لەگەڵ ئێراق بە بڕوای زۆربەی لێکۆڵەرەوە سیاسیەکان هەر دەگێڕنەوە بۆ دەستبەسەراگرتنی گشت کێڵگە نەوتیەکانی ناوچەی کەنداو.

لە ڕوانگەی ژینگەشەوە لە ئەنجامی کرداری سوتاندنی گازی سروشتی هیچ پاشماوەیەکی خۆڵەمێشی لێ بەجێ نامێنێت، و بەتەواوەتی دەسوتێت واتە گازی مونۆ ئۆکسیدی کاربۆنی (CO) کەمی لێ ئاوەڵا دەبێت، و ئاوەڵابونی گازی دیئۆکسیدی کاربۆنیش ($CO_2$) لە بەروارد لەگەڵ گشت وزەکانی دی نێو مادە فۆسیلیەکان زۆر کەمە، کە ئەم بابەتەش لە هێڵکاری ٦.٤ خوارەوەدا ڕونکراوەتەوە.




هێڵکاری ٦.٤: ڕێژەی ئاوەڵابونی گازی دی ئۆکسیدی کاربون لە نێو مادە فۆسیلیەکاندا

گشت مادەزیان بەخشەکانی دی وەکو پەیوەندیەکانی ئۆکسیژن و نایترۆجین (NOx)، بە ڕێژەیەکی زۆرکەم و دی ئۆکسیدی گۆگرد (SO2) و پەیوەندیەکانی کاربۆن و هایدرۆجین (H-C) لە ئەنجامی کرداری وەرگێڕانی وزە و سوتاندنی گازی سروشتی زۆر کەمترە لە چاو گشت وزەکانی دی نێو مادە فۆسیلیەکان.

سەرئەنجام لەم بەشەدا بەتەریبی لەگەڵ بیرۆكەی دابینكردنی وزەش هەوڵ درا هەنگاوەكانی پارێزگاری ژینگەی وڵات شیبكرێتەوە وەكو یەكێك لەوگشت بابەتانەی كە دەبێت ئەمڕۆ لە سایەی بونیادنانەوەی وڵاتماندا سەر لەنوێ ئاوڕی لێ بدەینەوە و هەروەها ڕۆشنایی خرایە سەر بابەتی گرنگی وزەی وڵات و هەڵبژاردنی وزەكەشی.

ئەمڕۆكە ئێمەی هاوڵاتی كورد پێویستە لەچوارچێوەیەكی مۆدێرندا بیر لە بەكارهێنانی وزە بكەینەوە، كە ئەم حاڵەتە خۆی لە هەرچی كەم كردنەوەی وزەی بەكارهێنراوی پێویستی گشتیماندا دەبینێتەوە. لە كۆتایدا لە ئەنجامی بەكوردستانی كردنی وزەی وڵاتیش، كە ئەویش مەبەست خستنەگەڕی گشت وزەی پێویستی وڵات بە هۆی وزەی وزەنوێبووەكان بەگشتی و بەتایبەتی گازی سروشتیەوە چونكە تا ئەمڕۆكەش بنەمای گشت تەكنۆلۆجیایەكی پیترۆكیمیاوی نەتها وزەی نێو مادە فۆسیلیەكانە، كورد وتەنی دەتوانین بە بەردێك دوونیشانە بشكێنین:

- سەرەتا وزەی وڵاتمان تاڕادەیەكی بەرچاو لە دست تێوەردانی دەرەكی پاراست،
- پاشانیش ڕێگە لە پیسبوون و شلەژاندی ژینگە دەگرین.

## ٦.١ چارەنوسی تەکنۆلۆجیایی پیترۆشیمیایی لە کوردستاندا

لە دایەگرامی ٦.٥ دا قۆناغی وەرگێڕانی نەوتی خاو بۆ بەرهەمەکانی تر بە هۆی ستونی دابەشکردن و بەهەڵمکردنەوە (Distillation Tower) دەهێنرێتە دی. لە پاش ئەوەی کە نەوتی خاو لە پەیوەندیەکانی خوێ، خاک و خاشاک پاک کرایەوە بە هۆی بۆری تایبەتیەوە دێتە نێو پاڵاوگەی وەرگێڕانەوە. لەم پاڵاوگەیە دا یاخود پارکی پیشەسازیەدا نەوت وەردەگێڕدرێت بۆ گشت بەرهەمە هایدرۆکاربۆنەکانی دی کە بۆ پێداویستیەکانی ڕۆژانەی هاووڵاتیان پێویستن.

لە سەرەتاد پاش ئەوەی کە نەوتی خاو لە شلدانی پاشەکەوتکردنەکەوە بەهۆی بۆریەوە دەگوازرێتەوە بۆ ئەو ئامێرەی کە لە نێویدا ڕێژەی خوێکەی دادەبەزێنرێت (Desalination) و پاشان دەنێردرێتە نێو بۆیلەرێکەوە Boiler تا پلەی گەرمای نەوتی خاوەکە ببرێتەسەرەوە (350 ° C- 400 ° C) تا گەیشتنی بە پلەی گەرمایی هەڵمبون Boiling Point کە ئەویش چند سەدپلەیەکی سەدییە. لە نێو ستونی دابەشکەرەکەدا گشت بەرهەمەکان بەهۆی چڕی و پلەی گەرمایی جیاوازەوە (Density & Boiling Point) لەیەکتری جیادەکرێنەوە. جیاکردنەوەکەش لەوە وە سەرچاوە دەگرێت کە هەر بەرهەمێک بە هۆی گۆڕانی ژمارەی کاربۆنەکان لە پلەیەکی جیاوازی گەرمادا دەکوڵێت و دەبێت بە هەڵم، بۆ

نمونە بەنزین لە پلەی گەرمایی ٣٥ تا ١٨٠ پلەی سەدیدا دەبێت بەهەڵم. واتە بەهەمان شێوەش گشت بەرهەمەکانی دی وەکو کیرۆزین Kerosene, Jet Fuel ، گازۆئیل Gasoline ...لەنەوتی خاوەکە جودا دەکرێنەوە.

تاوەری بەهەڵمکردنەکە لە کۆمەڵە بنکێک (Tray) پیکهێناوە بە قەبارەیەکی یەکسان، گشت بنکەکان لە سەر یەکتری دانراون. جار جارێک بۆ جیاکردنەوەی پەیوەندیە هایدرۆکاربۆنەکان، کە لە شێوەی کۆکتێلێکی پەیوەندی کاربۆن و هایدرۆجین دا یە، پێویستی بە سەدان بنک (Tray)هەیە لە تاوەرێکدا.

لە قەبارەی نێوان دوبنکدا دەبێت هەمیشە دۆخی شلی و گازی لە هاوسەنگی کیماویدا بن (Equilibrauim)،تا ئەوەی بتوانرێت بەهۆی تایبەتمەندی چڕی و پلەی گەرما پێکهاتەکان لە یەکتری جودا بکرێنەوە.

بەگشتی لە ئاخر بنکی سەرەوەدا گازەکانی مێتان Methan، ئێتان Ethan، پرۆپان Propan ، بوتان Buthan وەکو بەرهەم (LPG) وەچنگ دەکەوێت. بەهەمان شێوەش لە بەش و بنکی خوارەوەدا قیر و ئسفاڵت وەچنگدەکەوێت. لە خشتەی خوارەودا ٦.١ بە شێوەیەکی ساکار جیاوازی نێوان بەرهەمەکانی بەشی سەرەوەی تاوەرەکە و بەشی خوارەوەی ئەم تاوەرە ڕونکراوەتەوە.

خشتەی ٦.١: جیاوازی نێوان بەرهەمەکانی بەشی سەرەوەی ستونی دابەشکەرەکە و بەشی خوارەوە

| AT THE TOP OF THE DISTILLATION COLUMN | AT THE BOTTOM OF THE DISTILLATION COLUMN |
|---|---|
| Short carbon chains | Long carbon chains |
| Light molecules | Heavy molecules |
| Low boiling points | High boiling points |
| Gases & very runny liquids | Thick, viscous liquids |
| Very volatile | Low volatility |
| Light colour | Dark colour |
| Highly flammable | Not very flammable |

هـــەروەها لـــە خشـــتەی ٦.٢ دا تایبەتمەنـــدی گشـــت بەرهەمەکانی نێو ستونی دابەشکەرەکە ڕونکراوەتـەوە. لـەم خشتەیە دا ئەوەمان بۆ ڕوندەبێتـەوە کـە هـەرچی لەسـەروی تاوەرەکـەوە (ستونی دابەشکەرەکە) بـەرەو خـوارەوە بـڕۆین ژمـارەی کاربۆنـەکانی نێـو بەرهەمـەکان و پلـەی گـەرمای بەهەڵم بونیان بەرەوسەری هەڵدەکشێ، واتـە بەرهەمـەکان سەنگین دەبن.

خشتەی ٦.٢: جیاوازی نێوان بەرهەمەکانی بەشی سەرەوەی ستونی دابەشکەرەکە و بەشی خوارەوە

| Name | Number of Carbon Atoms | Boiling Point (°C) | Uses |
|---|---|---|---|
| Refinery Gas | 3 or 4 | below 30 | Bottled Gas (propane or butane). |
| Gasoline | 7 to 9 | 100 to 150 | Fuel for car engines. |
| Naphtha | 6 to 11 | 70 to 200 | Solvents and used in gasoline. |
| Kerosene (paraffin) | 11 to 18 | 200 to 300 | Fuel for aircraft and stoves. |
| Diesel Oil | 11 to 18 | 200 to 300 | Fuel for road vehicles and trains. |
| Lubricating Oil | 18 to 25 | 300 to 400 | Lubricant for engines and machines. |
| Fuel Oil | 20 to 27 | 350 to 450 | Fuel for ships and heating. |
| Greases and Wax | 25 to 30 | 400 to 500 | Lubricants and candles. |
| Bitumen | above 35 | above 500 | Road surface and roofing. |

وەهەروەها بەهەمان شێوە لەم دایەگرامەی خوارەوەدا بۆ هەرچی زانیاری زیاتر گشت بەرهەماکان و شێوەی سودلێوەرگرتنیان لە ژیانی ڕۆژانەی ئەمڕۆماندا ڕونکراونەتەوە.




دایەگرامی ٦.٥: وێنەی بەرهەمەکانی نەوتی خاو پاش کرداری پاڵاوتن لە ستونی دابەشکردندا

بۆ پەرەپێدانی تەكنۆلۆجیای پیترۆكیمیاوی بنەمایەكی پایەداری نەوت و گازی سروشتی لە هەرێمی كوردستانماندا پێویستیمان بە بنەمایەكی یاسای هەیە تا ئەو گشت كاتە بەفیڕۆچوەی لە داوی دامەزراندنی وڵاتی ئێراقەوە لە ساڵی ۱۹۲۰ وە دوبارە جوبران بكینەوە هەر لە ڕاستای هەڵوەشاندنەوەی ئەم مێژوەشومەدابوو كە لە پاش لێكۆڵینەوەیەكی زۆر لە ساڵی ۲۰۰۷ دا شرۆڤەی بڕیار بۆ پەسەندكردنی یاسای نەوت لە وڵاتی ئێراق گرنگترین خاڵی نێو زۆربەی وتووێژەكانی نێوان حكومەتی هەرێمی كوردستان و كاربەدەستانی ڕامیاری وڵاتی ئێراق بوو. چونكە هەر بڕیارێك لە ئەم كێشەیە دا لە داهاتودا كارتێكەری سەرەكی لە سەر سەقامگیری ئابوری و ڕامیاری هەرێمەكەمان دەبێت. هەر بۆیەش شرۆڤەكردن و گەڵاڵەكردنی ئەم یاسایە حكومەتی هەرێمی كوردوستانەوە گرنگیەكی بێ ئەندازەی پێدراوە.

بەڵام لەم بابەتەدا بەساكاری لێكۆڵینەوەیەك لەسەر ڕێچكەی ئێمە پاش پەسندكردنی یاسای نەوت لە هەرێمەكەماندا ڕون دەكرێتەوە.

هەر كۆمەڵگایەكی خاوەن ئەم كانزایانە ئەگەر كاتێك بنەمای ئابوری خۆی لەسەر هەڵوەشاندنی نەوتی خاو و گازی بنزەوی و پەرەپێدانی تەكنۆلۆجیایی پیترۆشیمیای و پۆلیمەرەكان (لاستیك، پلاستیك، ڕەنگ، ڕۆن، قۆماش،

دەرمان....) دامەزراند ئەوا بێشک دیارەدی بێکاری و پتەوی چوارچێوەی ئابوری خۆی سەقامگیر کردووە. لە وێنەی خوارەوەدا بەشە پاڵاوتەکانی نەتی خاو لە هەر بەرمیلێکدا خراوەتەڕوو.




وێنەی ٦.٦: بەشەکانی نەوتی خاو پاش کرداری پاڵاوتنی نەوت

لەبەر ئەوەی کە نەوتی خاو لە کۆکتێلێک و پێکهاتەیەکی کۆمەڵە کاربۆنێک و هایدرۆجین پێکهاتووە دەتوانرێت هەروەکو چۆن لەسەرەوە شیکرایەوە بەهۆی جیاوازی لە ژمارەی کاربۆنەکان و چڕیەکەی Density و پلەی گەرمای Boiling Point بەهەڵمچونیاین لە یەکتری جیا بکرێنەوە.

بۆ نمونە گازی شلی (LPG) کە لە کاربۆنەکانی (C3,C4) پێکهاتوەو و لە پلکەیەکی گەرمایی ١٠/ تا ١٥ دا لە دۆخی شلی دایە. بەنزین لە پلەی گەرمایی ٣٥ تا ١٥٠ پلەدا جیادەکرێتەوە. بەهامەن شێوە تا بەرەو خاوارەوەبێن پلەی گەرمای کوڵان بەرەو سەرێ هەڵدەکشێت و ژمارەی کاربۆنەکانیش زیاد دەبن.

تا ئەمرۆکەش گشت ئامێرەکانی گەیاندن چ لەسەر زەوی چ لە نێو دەریاو سوتەمەنی بۆ فڕۆکەکان بەندە بە گشت بەرهەمەکانی نەوتی خاو پاش پاڵاوتنی، هەر بۆیەش هیچ کانزایەکی دی نیە کە بتوانێت بەوچڕییە وزەیی تێدا کۆکرابێتەوە و لەم بوارەدا جێگەی بگرێتەوە. کەواتە تا داهاتویەکی سەدساڵە نەوتی خاو تاکە وزەی باڵادەستی نێو جیهانی پیشەسازی دەبێت.

بەهامان شێوەش گازی بنزەوی و شێوازی مۆدێرن بۆ گەیاندن و بەشلەمەنی کردنی ئەم کانزایە لە دوای ساڵانی ۱۹۸۰ وە پاش پەرەسەندنی هوشیاری کۆمەڵایەتی واتە پاڵەپەستۆ بۆ پاکژی ژینگە و سودلێوەرگرتنی ئەم کانزایە لە بواری وەرگێڕانی وزەی کارەبا لە وێستگەی پێکەوە لکێنراوی هەڵم و گاز لە ونێو وڵاتە پیشەسازیەکاندا پێگەو گرنگیەکی تایبەتی وەرگرتوە کە ساڵ لە دوای ساڵ ڕێژەی سودلێوەرگرتنی لە دونیای وزەدا بەرەوسەرێ هەڵدەکشێ و ئەمڕۆکە ئەم کانزاسەرەتایە بە بەنرخترین کانزا لەسەر ڕوی زەوی لە دوای نەوتی خاو دەژمێردرێت.

بەڵام ئەم دوو کانزا پڕبایەخە لە دوو چەمسەرەوە پاڵەپەستۆی لە سەرە، جەمسەرێکیان پۆخەڵی ژینگە یەو جەمسەرەکەی تریان دیاردەی تیرۆریستە چونکە زۆرەبەی هەرە زۆری ئەم کانزایانە دەکەوێتە نێو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە.

هەرێمی کوردستانیش یەکێکە لەو ناوچانەی دونیا کە لەم دووکانزا بەنرخە بێبەش نییە. ئەم هەرێمە یەکێکە لەهەرە هرێمە پڕبایەخەکانی نێو سەراسەری دونیا کە تا ئەمڕۆکە گشت پۆتێنسالی وزەکەی بەرهەم نەهێنراوە و زۆربەی هەرەزۆری چاڵەکانی نەوت و گازی بەپڕی ماونەتەوە.

کەواتە ئەم زەخیرانە سەرمایەیەکی بێشومارە کە ڕۆژ لە دای ڕۆژ کە ئەگەر لە نێو زەویدا بمێنێتەوە ئەوا نرخەکەشی بەرەو سەرێ هەڵدەکشێت، هەر بۆیەش پەلە نەکردن لە دەرهێنانای ئەم سەرچاوانە هێشتنەوەی سەرمایەیەکی ئامادەیە بۆ نەوەکانی داهاتومان.

لەبەراورد لەگەڵ نەوت دا گازی سروشتی بەپێی تێڕوانینی ژینگە و ڕێژەی ئاوەڵا بوونی دیی ئۆکسیدی کربۆن ($CO_2$) لەپاش کرداری سوتاندن پێگەیەکی پاشتری هەیە واتەکاریك بکرێت کە گاز ببێتە سوتەمەنی سەرەکی لە هەرێمدا.

دیارە داڕشتنی چوارچێوەی سودلێوەرگرتنی نەوتی خاو و گازی بنزەوی بۆ وەرگێڕانی ئەم کانزایە بۆ بەرهەمە پیترۆکیمیاوییەکان پەسەندترین بیرۆکەیە ئەگەر وەکو ڕێڕەوی ڕامیاری لە هەرێمدا هەوڵبدرێت لەداهاتودا ڕێگە لە فرۆشتنی سادەی نەوت و گاز وەکو دۆخی خاو بگیردرێت و زۆرتر پڕۆژە لە بواری پالاوتن و وەرگێڕانی نەوت و گاز بۆ

پێکهاتەکانی دی نەوت وگاز بخرێتە گەر تا ئەوەی بەهۆیانەوە بتوانین هێزی کار ببوژێنینەوە و کوردستان مۆدێرن بکەین.

چونکە هەردەم بەشە پاڵاوتەکانی بواری نەوت و گاز واتە مادەی کیمیاویی تایبەتی نێویان ( Plastics, Materials for clothes (Polyester fabrics, Paints, Chemicals for evreyday use ) لەلایەنی ئابوریەوە بەنرخترن و باشترن تا فرۆشتنی نەوت وگاز بەشێوەیەکی خاو. لە وێنەی خوارەوەدا کۆمەڵە کەلوپەلێکی پلاستیکی نیشان دراوە.



وێنەی ٦.٧: وێنەی کۆمەڵە کەلوپەلێکی پلاستیکی پێویستی نێوماڵ

ئەگەر توانای بەرهەمهێنانی نەوت و گازی بنزەی لە هەرێمی کوردستاندا لە توانای وەرگێرانی گشت پرۆژە

پیترۆشیمیایەکان زۆرتر بوو ئەوا بیر لە ناردنەدەرەوەی ئەم کانزایانە بەهۆی بۆری نویّ وە بکریّتەوە کە بە نیّو ناوچە پاریّزراوەکانی نیّو هەریّمی کوردستاندا بڕوات و تاکە ڕیّگەی ناردنەدەروەی ئەم کانزایانەش لە بەراوردی نیّوان گشت دراوسێیکانمان تەنها وڵاتی تورکایە.

هەڵبژاردنی ئەم وڵاتەش بەهۆی لەبەر چاوگرتنی بارودۆخی سیاسی و نزدیکی وڵاتی تورکیا لە بازاڕەکانی ئەوروپاوە و توانای وەرگرتن و پاشەکەوتکردنی بڕیّکی زۆری نەوت و گازە لەم وڵاتەدا. هۆی ئەم بڕیارەش دەگەڕیّتەوە بۆ ئەوەی چونکە سەرەتا لایەنی ئیّرانی بەهۆی شاخاوی بونی سنورەکانمان و دوری لە بازاڕەکانی دونیاو کیّشەی ڕامیاری ئەو وڵاتە لەتەک گشت دونیا و پاشان لایەنی وڵاتی سوریا بەهۆی دواکەوتوی پیشەسازی و ناسەقامگیری نیّودەڵەتی ئەو وڵاتە و لەکۆتایدا نائارامی لە ناوچەکانی ئیّراق تەنها ڕیّگەی وڵاتی تورکیامان بۆ دەهیّلیّتەوە.



وێنەی ٦.٨: وێنەی تاوەرەکانی پاڵاوتن لە وێستگەیەکی پیترۆکیمیاویی

نەوتی‌خاو و گازی سروشتی تا ماوەیەکی دورو درێژ دەبێت وەکو سەرچاوەی وزەی وڵات بیری لێبکرێتەوە لە بواری گواستنەوەدا تائەمڕۆش گشت وزەی نێو مەکینەی سەیارەکان لە بەرهەمی نەوتی خاوەوە دێت. بۆ نمونە لەو خشتەیەی خوارەوەدا چونێتی هەڵکشانی دانیشتوانی دونیا و ژمارەی سەیارەکان لەگەڵ وابەستەیی بە بەرهەمەکانی نەوتەوە خراوەتەڕوو [12]

خشتەی ٦.١: چۆنێتی هەڵکشانی دانیشتوانی جیهان و پابەندی بە نەوت و بەشەکانیەوە

| | ١٩٦٠ | ٢٠٠٠ | ٢٠٣٠ | ٢٠٥٠ |
|---|---|---|---|---|
| ژمارەی دانیشتوان لە دونیادا | $3 \times 10^9$ | $6 \times 10^9$ | $8 \times 10^9$ | $8,9 \times 10^9$ |
| ژمارەی گشتی سەریارەکان | $0,1 \times 10^9$ | $0,7 \times 10^9$ | $1,4 \times 10^9$ | $3 \times 10^9$ |
| پێویستی نەوت بە $m^3$ | $1,1 \times 10^9$ | $3,5 \times 10^9$ | ? | ? |
| بەشی بەرهەمەکانی نەوت لە بواری گواستنەوەدا | > 97% | > 97% | ? | ? |

## ٦.٢ لە گازی سروشتییەوە بۆ تەکنۆلۆجیای پیترۆکیماوی

لە پاش نەوتی خاو گازی سروشتی گرنگترین وزەی سەرەتایی نێو کانزا فۆسیلییەکانە. لە هێڵکاری خوارەودا چۆنێتی هەڵهێنجان و جیاکردنەوەی گشت کانزا سەرتایی یە هایدرۆکاربۆنەکانی وەرگێراو بۆ وێستگە پیترۆکیمیاوەیەکان بە هۆی گازی سروشتییەوە خراوەتەڕوو.




هێڵکاری ٦.٨: چوارچێوە و بنەمای کاری وێستگەیەکی پیترۆکیماوی بە هۆی گازی سروشتیەوە

گازی سروشتی لە دونیای پیشەسازی ئەمڕۆکەدا بنەمای تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاویی یە. ئەم گازی سروشتیەش لە بەراورد لەگەڵ نەوت و خەڵوزی بەردین بەشێوەیەکی عادیلانە تر بەسەر گشت ناوچەکانی دونیا دا دابەش بووە و تەنها لە یەك ناوچەی دیاریکراودا چڕ نەبۆتەوە. بەڵام گرفتی ئەم کانزایە لەوە دایە کە چۆن وە بەهۆی چ ڕێگەیەکەوە بگوازرێتەوە بۆ نێو وڵاتە پیشەسازیەکان کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پابەندی تەکنۆلۆجیای ئەم وڵاتانە بەم کانزایەوە زێدەتر دەبێت. لە ٢ % گشت کانگاکانی گازی بن ئەرز لەسەراسەری دونیا دەکەوێتە وڵاتی ئێراقەوە، کە واتە نیشتیمانی ئێمەش لە چاڵەکانی گازی سروشتی ئامادە بۆ بەرهەم بێبەش نییە و 1,5 % ی گشت چاڵەکانی دونیایە کە ئەمەش ڕێژەیەکی خەیاڵییە. بەپێی تازەترین ئاماری ئەوروپییەکان چاڵەکانی گازی بنزەوی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تا نزیکەی ٢٠٠ساڵی تر دەتوانرێ لێیانەوە گازی سروشتی بەرهەم بهێنرێت. واتە پاش دارشتنی سیاسەتێکی ڕاست تا داهاتویەکی دور ئەم گازە سروشتییە دەتوانێت پایەیەکی نەگۆڕی گشت وزەی نێو هەرێمی خۆمان بێت.

### خاڵە باشەکانی گازی بنزەوی:

١. بەشێوەیەکی گونجاو دەتوانرێ لە وێستگەی گازوهەڵم بۆ وەرگێڕانی وزەی کارەبا وەکی سوتەمەنی بەکاربهێنرێت،

٢. بنچینەی گازی سەرەتاییە بۆ گشت کارگە کیمیاوییەکان،

٣. باشترین جۆری وزەیە بۆ سوتەمەنی و گەرمکردنی نێومالٚ،

٤. باشترین وزەی فۆسیلی سەرەتاییە کە ژینگە لە ئەنجامی سوتاندنیدا زۆر بە دی ئۆکسیدی کاربۆن ( $CO_2$ ) و گازە ژەهراویەکانی دی پیس نابێت.

گازی نێو چاڵەکانی بن زەوی پاش کرداری پاکژکردنەوە و پالاوتن لە کۆمەڵە دۆخێکی جیاوازدا دەتوانرێت بە چەند ڕێگەیەکی جیاواز بگوازرێتەوە، لە ئەنجامی لێکدانەوەی ئابوری بۆ بڕی گازی سروشتی و دوری گوێزانەوەی گازی سروشتیەکە، یەکێک لەو ڕیگایانەی خوارەوە هەڵدەبژێرین. لە هێڵکاری خوارەوەدا ڕێگاکانی گواستنەوەی گازی سروشتی ڕونکراونەتەوە. مەبەست لە (GTW) بە مانانی (Gas To Wire) واتە سودوەرگرتنی گاز بۆ وەرگێڕانی وزەی کارەبا. مەبەست لە (GTL) بەمانای (Gas To Liquids) دێت.

هەروەها مەبەست لە (DME) بەمانای (Di-Methyl Ether) کە ئەمەش بەرهەمێکی پیترۆکیمیاویە بۆ بەدەستهێنانی ڕەنگەکان.




هێڵکاری ٦.٩: ڕێگاکانی گواستنەوەی گازی سروشتی بە کۆمەڵە دۆخێکی جیاواز

لەو لێکدانەوە ئابوریەدا قەبارەی گازی سروشتیەکە بە MMSCF و دوری گوێزانەوکە لە دۆخە جیاوازەکاندا بە km دەپێورێت. بەهۆی ئەو هێڵکاریەوە ئەوە ڕوندەبێتەوە کە گوێزانەوەی گازی سروشتی بەهۆی بۆریەوە تا بڕی ٢٠٠٠ ملیۆن قەدەم سێجا تا دوریەکی ٢٥٠٠ کیلۆمەتر ئابوریە، بەڵام بۆ گوێزانەوەی گازی سروشتی لە دۆخی شلیدا بۆ ئامانجێکی دورتر دەبێت سود لە شلدانی دەریایی (LNG) وەربگیرێت.

ئێستا سێ ڕێگەی ناسراو بۆ گوێزانەوەی گازی سروشتی ڕوندەكرێتەوە:

## ١- بەشێوەی لولەی بۆری ( Pipeline)

ئەم ڕێگەیە گرنگترین هەوڵی گوێزانەوەی گازی سروشتی یە لە سەرتاسەری جیهاندا چونكە ئەمرۆكە نزیكەی ٩٠% گشت گازی سروشتی جیهان بۆ وڵاتە پێشكەوتوەكان بەهۆی ئەم بۆریانەوە (Pipelines) دەگوازرێتەوە.

پاش شیرنكردنی گازی بن زەوی واتە پوختەكردنی لە پەیوەندیەكانی گۆگرد، نایترۆجین و ئاو و دی ئۆكسیدی كاربۆن بە هۆی پاڵنەری تایبەتیەوە (Gas Compressor) گازەكە بە بۆری دەگوازرێتەوە بۆ مەبەستی پێناسەكراو. لە دایەگرامی خوارەوەدا چۆنێتی كرداری شیرینیكردنی گازی سروشتی خراوەتە ڕوو.




وێنەی ٦.١٠: دارشتنی پرۆسەی شیرینكردنی گازی سروشتی

*كرداری شیرینكردنی گازی سروشتی

لە نوێترین پرۆژەی نێو هەرێمی كوردستاندا هەوڵدەدرێت كە بەم شێوەیە گاز بگەیەنرێتە دوو وێستگەی وەرگێڕانی وزەی كارەبا لە هەولێر و چەنچەماڵ. كە ئەم وێستگانەش باشترین بەڵگەن بۆ هەنگاونانی وەرگێڕانی وزەی كارەبا بە بیركردنەوە لە پاراستنی ژینگە. بەڵام بۆ نەهێشتنی كەموكوڕی لەم وێستگانەدا پێویستە بەشی وەرگێڕانی كارەبا بەهۆی هەڵمی ئاوی تێدابنرێت تا چوستی وێستگەكە بەرەوسەرێ ببرێت و بە سودوەرگرتن لە هەمان بڕی گازی سوتاو وزەی كارەبای زیاتر وەربگێڕین.




وێنەی ٦.١١: وێنەی چوارچێوەی كاری وێستگەی گازی كۆرمۆر تا گەیاندنی گازی شیرین بۆ وێستگەی كارەبای هەولێر

لە وێنەی سەرەوەدا چوارچێوەی کاری ئەو پڕۆژەیە ڕونکراوەتەوە. هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی پڕۆژەکە لە ساڵی ٢٠٠٧ وە تا سەرەتای ساڵی ٢٠٠٩ لە وەزارەتی پەیوەندیدار لە حکومەتی هەرێمی کوردستان لەم پڕۆژەدا سەرپەرشتی کارە تەکنیکیەکانم گرتوبووە ئەستۆ.

سەرەتا لەم پڕۆژەیەدا پاش دەرهێنانی گازی سروشتی لە نێو بیرەکان هەوڵدەدرێت کە ئەم گازە لە گشت پێکاهاتەکانی ئاو و گۆگردو هایدرۆکاربۆ نە سەنگینەکان واتە پێنتان و بەرەوسەرێ ($C_{5+}$) جیابکرێتەوە.

پاشان لە تاوەرێکی جیاکەرەوەدا بە هۆی پرۆسەی هەڵمژینی ئەبزۆربشن (Absorption Process) ی تایبەتیدا ئەم گازە سروشتییە لە پێکاهاتەی ($H_2S$) دەشۆرێتەوە، واتە ئەم گازە سروشتیە شیرین دەکرێت. چونکە پێکهاتەی گۆگرد و هایدرۆجین ($H_2S$) دەبێتە هۆی خوڵقاندنی ترشی گۆگردی و ئەمە هۆکارێکە بۆ ژەنگ هەڵهێنانی گشت ئامێرەکانی نێو وێستگەکە، هەربۆیەش ئەم کارە تەکنیکیانە بە پرۆسەی شیرینکردنی گازی سروشتی ناوزەد کراوە، واتە:

.(Gas Sweetening Process )

پاشان دەبێت گازی شیرینکراو لە پرۆسەیەکی هاوشێوەی سەرەوەدا کە بە هەڵمژینی ئەدزۆەپشن ( Adsorption Process) ناوزەد دەکرێت لە ئاوی بەهەڵمبوو لە نێو گازە سروشتییەکە دا پاک بکرێتەوە، واتە:

(Dehydration by using Adsorption Process)

لە کۆتایدا ئەم گازە سروشتی یە شیرینکراوە لە گشت کاربۆنە سەنگینەکانی تر وەکو بوتان وپرۆپان (C3, C4) جودا دەکرێتەوە. پاشان بەهۆی بۆریەکی "٢٤ ئینجیەوە بەرەو هەردو وێستگەی کارەبای هەولێر و بازیان ڕەوانە دەکرێت. تکایە براوانە نەخشەی ٦.١٢.

بەگشتی ئەم پرۆژەیە یەکێکە لە نوێترین پرۆژەی گازی شروشتی نێو چوارچێوەی جوگرافی وڵاتی ئێراق. سودوەرگرتن لە گازی سروشتی لە وڵاتی ئێراقدا بە هۆی دواکەوتویی پیشەسازی بواری گازی سروشتی ڕابوردویەکی زۆر دورو درێژی نی یە، تا ئەمرۆکەش لە سەرتاسەری ئێراقدا، بە تایبەتی باشوری ئێراق، ڕۆژانە نزیکەی ملیۆنێک مەترسێجا گازی سروشتی بەهۆی نەبونی تەکنۆلۆجیای شیرینکردن و بۆری گواستنەوە لە وێستگەکانی نەوتدا دەسوتێنرێت.

هەروەکو چۆن لەم نەخشەیەدا دیارە، سەرەتا گازەسروشتی یەکە لە ناوچەی نزیکی قادرکەرەم پاکدەکرێتەوە بەهۆی بۆریەکی "٢٤ ئنجەوە دەگوازرێتەوە بۆ وێستگەی کارەبا لە ناوچەی بازیان لە نزیکی شاری چەمچەماڵ و پاشان بۆ وێستگەی دووەمی کارەبا لە ناوچەی هەولێر. لە ئەم دوو وێستگەیە دا لە نێو گازتۆربایناکانیاندا گازی سروشتی دەسوتێنن و لە ئەنجامیدا وزەی کارەبا وەردەگێڕن.

Pipeline Route (Preliminary)

نەخشەی ٦.١٢: گوێزانەی گازی سروشتی لە کۆڕمۆڕەوە بۆ هەردوو وێستگەی کارەبای بازیان و هەولێر.

## ٢. بەشێوەی شلـەمـەنـی ( liquefied natural gas -LNG).

لـەپاڵ گوێزانـەوەی گـازی سروشتـی بـە بۆری (Pipeline) ئـەم جۆری گوێزانـەوەیە لـە دۆخـی شلـیدا بـەهۆی شلـدانـی مـەزنـی دەریاییـەوە (Tanker) دێتـە ئـاراوە. سودمـەندی سـەرەكی ئـەم جـۆرە گوێزانـەوەیـە ئـەو وڵاتانـەن كـە لەكـەناری دەریاكانـەوەن. وڵاتـە كانـی باشوری ئاسیا و باشـوری ئـەوروپا زۆر گرنگـی بـەم ڕێگەیـەی گواستنـەوەی گـازی سروشـتیـەوە دەدەن. لـە داهـاتودا وڵاتـی قەتـەریش بـە هـۆی زەخیـرەی سامانـی سروشتـی گازەكـەو شوێنـی جوگرافیەكـەی گرنگترین وڵاتـی نـاردنـی گـازی شـل (LNG) دەبێـت بـۆ گشـت وڵاتـە پیشەسازییەكانی ئەوروپا و ئاسیا.

هـەروەكو لـە وێنـەی خـوارەوەدا هـاتووە پـاش ڕوپێووكرن، واتـــە، دۆزینـــەوە و دەرهێنـــانی گـــازە سروشـــتیەكە (Exploration&Production) دەبێـت ئـەوگازە بگۆڕدرێـت بـۆ دۆخـی شلـەمـەنـی (Liquefaction) وە پاشـان بـەهۆی كـەشتیـەوە (Shipping ) دەنێردرێتـە ئەو وڵاتانـەی كـە پێویستیان پێیـەتـی و پـاش گـەیشـتنـی پاشـەكـەوت دەكرێـت و دەگۆڕدرێتـەوە بـۆ دۆخـی گـازی و بـەهۆی بـۆری تایبـەتـەوە دەگاتـە شـوێنـی سودلێوەرگرتن (Regasification and End Users )




وێنەی ٦.١٣: گازی شل و قۆناغەکانی بەشلەمەنیکردنی تا گەیاندنی بۆ شوێنەکانی سودلێوەرگیراو

### ٣. لە دۆخی شلەمەنیدا (LPG: Liquefied Petroleum Gas)

گازی شل (LPG) کە پێکهاتەی Propan پرۆپان (C3H8) و بۆتان (C4H10) Butan پێکدێت. لە سەرانسەری دونیادا ئەم گازە بە ڕێژەی ٤٩ % لە بوارەی نێومالّ و دوکانەکاندا و ٢٢ % لە نێو گارگە شیمیایەکاندا و بە ١٤ % لە بواری پیشەسازیدا و لە ٧ % لە نێو پالاوگەکاندا و بەڕێژەی ٦ % بۆ سوتەمەنی نێو سەیارەی ئۆتۆ و لە کۆتایدا بە ڕێژەی ٢ % لە بواری کشتوکالّیدا سودی لێوەردەگیردرێت. (Shell)

ئەم گازە دەتوانرێت لە پاش پالاوتنی نەوت و بەشێوەیەکی سەرەکی لە گازی سروشتیەوە بەرهەمبهێنرێت. و بەهۆی بەرزکردنەوەی فشارێکی نێوان (٦ تا ٨ bar) لە پلەی گەرمایی ئاسایی C– ٢٥ لە دۆخی گازیەوە دەگۆڕدرێتە دۆخی شلی. ئەم گازە پاش سوتاندنی لە بەروارد لە گەلّ گشت کانزا فۆسیلیەکانی دی نابیتە هۆی پۆخلّی ژینگە. کەواتە ئەم وزە فۆسیلییە سەرەتایە دەتوانرێت بە پالّپشتی وزە نوێبوەکان (Renewable Energy) لە هەرێمی کوردستاندا بێتە پایەیەکی نەگۆڕ بۆ وەرگێڕانی وزە.

هەر لەڕوانگەی ئەم بیرۆکەیەشە کە لە نوێترین پڕۆژەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا تاسالّی ٢٠٠٨ بڕیاری جێبەجێکردنی دوو وێستگەی گازی شل دراوە کە زۆربەی

پێداویستیەکانی هاوڵاتیانی هەرێم بۆ گازی نێو بتڵی نێوماڵ دابیندەکات.




وێنەی ٦.١٤: پاشەکەوتکردنی گاز لە دۆخی شلەمەنیدا LPG

لە نێو گشت وڵاتەکانی کەنداویشدا کۆمەڵە بەرنامەیەکی چڕوپڕ بۆ پەرەپێدانی ئەم تەکنۆلۆجیایە و دەستبەسەراگرتنی گازی سروشتی بۆ داهاتو دارێژراوە. وڵاتی قەتەر دەیەوێت توانای بەرهەمهێنانی گازی شلەمەنی (LNG) لە ساڵی ٢٠٠٥ کە ٢٥ ملێۆن تەن وە تا ساڵی ٢٠١٢ تا ٧٨ ملێۆن تەن بەرەوسەرێ بەرێت. کاربەدەستانی وڵاتی کویەت خوازیاری ئەوەن کە بۆ ماوەی ١٥ ساڵی ئایندە نزیکەی ٥٥ ملیارد دۆلار لە پەرەپێدانی

تەکنۆلۆجیای هەڵهێنجان، گواستنەوە، پاشەکەوتکردن و پاڵاوتنی نەوت و گازی سروشتی تەرخان بکەن.

لە ئەم هەرێمەی خۆشماندا پێویستە لەکاتی داڕشتنەوەی نوێی تەکنۆلۆجیای نەوت وگاز لە چواچێوەی جوگرافی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا گازی سروشتی ببێتە سەرەکیترین وزەی هەرێم.

چ لە ڕوانگەی پاراستنی ژینگەوە ببێتە تاکە پایەی سوتەمەنی و چ لە ڕوانگە پەرەپێدان بە پێکهاتە شیمیایە نایابەکان وەکو پەینی کیمیاوی و ( Ethylene, Styrene, Polyethylen, Polypropylen, Methanol, Urea,). کەواتە بە پێی ئەو نمونانەی سەرەوە ڕێڕەوی ئەگەر سیاسەتی وزە لە هەرێم دا بەرەو پەرەپێدان و هەڵهێنجانی گازی سروشتیی دەڕوات ئەوا پراکتیزەکردنی ئەم بڕیارانە لە هەرێمەکەماندا پاش بەردەوامی ئارامی پێویستی بە کاتێکی زۆر و کۆمەڵە کادیرێکی تەکنیکی ناوخۆ هەیە.




وێنەی ٦.١٥: کێڵگەیەکی گازی سروشتی

خاڵێکی تری بەرەو پێشبردنی پیشەسازی وڵات بە هۆی تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاویەوە خۆی لە دۆزینەوەی هێزی کار بۆ بێکارەکانی وڵات دا دەبینێتەوە.

واتە بەهۆی وەزارەتی پەیوەندیدار هەوڵ بدرێت توانای کاری گروپی لە کوردستاندا پەرە پێبدرێت، چونکە لە زۆربەری وڵاتە پێشکەوتوەکاندا توانای کاری تەنهای و گورپی زۆر پتەو و پێشکەوتووە.

بەڵام لەگەڵ ئەوشدا کە توانای کاری تەنهایی لە کوردستاند زۆر سەرکەوتو نیە، لەهەمانکاتدا تا ئەمڕۆ بیر لە پەرەپێدانی توانای کاری گروپی واتە

(ability to work in a team) نەکراوەتەوە، چونکە لە وێستگە پیترۆکیمیاویەکاندا کۆمەڵە کارگەیەک بەیەکەوە هەوڵی خولقاندنی تاکە بەرهەمێک دەدەن.

لە وێنەی خوارەوەدا وێستگەیەکی گازی سروشتی خراوەتە ڕوو کە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ وێستگە و پاڵاوگەیەکی نەوتی خاودا نییە.



وێنەی ٦.١٦: وێستگەیەکی پیترۆکیمیاوی

## ٦.٣ پابەندیی ئامێرەکانی گواستنەوە بە بەشەکانی نەوتی خاوەوە



وێنەی ٦.١٧: گرنگی بەنزین بۆ هێز و توانای نێو مەکینەی سەیارەکانی گواستنەوە

بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیاوە گەورەترین ئارەزوی مرۆڤ کە گەڕان و شارەزابونە هاتۆتەدی. لەم ڕۆژگارەی خۆماندا هەر ئاسانکاری لە بوارەکانی گواستنەوە و گەیاندنیش بونەتە هۆی پەرەسەندنی دیاردەی عەولەمە (گلۆبالیزم) لە سەرتاسەری جیهاندا.

له پاش دۆزینەوەی نەوتی خاو بەگشتی و بەتايبەتی لە سالەکانی ۱۹۰۰ بەدواوە کە بەرهەمەکانی پالاوتنی نەوتیش هاتنە نێو بازاڕەکانی جیهانەوە توانرا پەرە بەتەکنۆلۆجیای گواستنەوە بدرێت و مەکینەکانی ئۆتۆ و وەپاشانیش گازتۆربایینەکانی نێو فڕۆکەکانیش هاتنە ئاراوە، کە ئەم ئامێرانەی گواستنەوە گۆڕانێکی ڕادیکالیان بە سەر کرداری گواستنەوەدا هێنا.

واتە مرۆڤ دەتوانێت ئەمڕۆ بەشێوەیەکی ساکار لە چەند کاتژمێرێکدا هەزارەها کیلۆمەتر ببڕێت و بە ئاسانی سەردانی نەک شارەکان بەڵکو قارەکانیش بکات.

بەردی بناغەی ئەم پێشکەوتنە لە بواری ئاسانکاری گواستنەوە دا نەوت و بەرهەمەکانیەتی. هەر بۆیە بە بێ کانزای نەوتی خاو, بەنزین یش ناتوانرێت بەم شێوەیە بە هەرزانی بپالێورێت و بهێنرێتە بەرهەم، کەواتە بەبێ کانزای سوتێنەری نێو مەکینەکان کاری گواستنەوەش بەم شێوە پەرەسەندوەش ڕادەوەستێت، چونکە هێزی کار و وزەی نێو مەکینەکانی گواستنەوەش بە گشتی بە بەنزینەوە بەندن.

له جیهان دا بەگشتی زۆربەی زۆری نەوتی خاویش لەم بوارەی گواستنەوەدا دەسوتێنرێت. بەهۆی زۆری ژمارەی سەیارەکان (بۆ هەر دوو نەفەرێک یەک سەیارە) لە ولاتە پێشکەوتوەکاندا بە پلەی یەکەم ئەمریکییەکان وە لە پاشان

ئەوروپاییەکان گەورەترین سوتێنەری بەنزینی سەیارەن لە سەرتاسەری جیهاندا. هەر لە بەر ئەم هۆیەشە ئەم وڵاتانە ساڵانە پێویستیان بە بڕێکی زۆرتری هێنانە ناوەی نەوتی خاو هەیە. کەواتە لە ئەم وڵاتانەشدا چەرخێنەری پیشەسازیەکەیان هەر کانزای نەوتی خاوەو بە تەواوەتی پابەندن پێوەی.

لە پاش بەنزین، گازوائیل یاخود کیرۆزین دێت، کە ئەوانیش لە سەرەکیترین کانزای سوتێنەری نێو مەکینەی سەیارەکان و نێو گازتۆربایینی فڕۆکەکانن و کە ئەمانەش سەرەکیترین بەرهەمەگرنگەکانی نێو پاڵاوگەکانی نەوتی خاون. هەروەها گشت پارچەکانی پێکهێنەری نێو سەیارەش هەر لە لاستیک، ڕەنگ، وقوماش و ڕۆن و پۆلیمەرەکان لە نەوتی خاوەوە سەرچاوە دەگرن.

لە وێنەی ٦.٦ دا بەشە سەرەکییە پاڵاوتەکانی نەوتی خاو لە هەر بەرمیلێکدا خراوەتە ڕوو، کە بەهۆی ئەم بەرهەمانەشەوە دەتوانرێت لە نێو وێستگە پیترۆکیمیاوەیەکاندا هەزارەها بەرهەمی تر بهێنرێتە بەرهەم، کە بەشی زۆربەی کەرەسەو ئامێرەکانی گواستنەوەش لەم بەرهەمانەوە سەرچاوە دەگرن. هەربۆیەش جگە لە هێزو توانای نێو مەکینەکان، خولقاندنی پێداویستی خودی کەرەسەکانی گواستنەوەش بە سەیارەو فڕۆکەوە بە بەرهەمەکانی نەوتی خاوەوە بەندە.

لە بەراود لەگەڵ بەرهەمەکانی نێو نەوتی خاو بە تێڕوانینێک لە بواری پارێزگاری لە ژینگە و ئابوریدا، بەرهەمەکانی نێو گازی سروشتی باشترن، چونکە ئاوەڵابونی گازەکانی پاشماوەی سوتاندنی $(NO_x, CO_2, CO)$ گەلێک کەمترن.

وە هەر ئەم هۆیەشە کە لە نێو گشت وڵاتە پیشەسازیەکانی نێو جیهان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بڕی پێوستی بەکارهاتوی گازی سروشتی بەرەو سەری دەچێت. نوێترین هەنگاوی نێو وڵاتە پێشکەوتوەکان ئەوەیە کە سود لە گازی شل (LPG) وەکو وزەیەکی پلەدوو بۆ نێو مەکینەکانی گواستنەوە وەردەگرن، هۆی ئەم سود لێوەرگرتنەش دەگەڕێتەوە بۆ هەرزانی ئەم بەرهەمە و پارێزگاری لە ژینگەی وڵات.

ژمارەی سەیارەکانیش لە نێوان وڵاتەکاندا بەشێوەیەکی یەکسان نی یە. بۆ نمونە لە نێو وڵاتە پیشەسازیەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا بۆ هەر دوو نەفەرێک سەیارەیەک هەیە و لە هەمان کاتیشدا لە نێو وڵاتانی بەرەو پیشەسازی وەکو هیندستان بۆ هەر ١٢٥ نەفەرێک تەنها یەک سەیارە و لە نێو وڵاتی چیندا بۆ هەر ١٠٠ هاوڵاتیەک تەنها یەک سەیارە وجودی هەیە.

هەر بۆیەش بەبێ دوودڵی لەئەنجامی بەرەوپێشچونی پیشەسازی چاوەڕوانکراو، ئەگەر هاووڵاتیانی وڵاتەکانی

وەکو هیندستان و چین ژمارەی سودلێوەرگرتنی سیارەکانیان بە ئاستی هاوولاتیانی ئەوروپایەکان بگەیەنن، ئەوا بڕی پێویستی بەنزین و توانای وێستگەکانی وەرگێڕان و پالاوتنی بەنزین لە نێو جیهاندا دەبێت سەد بەرابەر بەرەو سەرێ هەلبکشێت، کە ئەمەش لە ئەنجامی کرداری سوتاندنی نێو مەکینەکان ئەم کارتێکەریانەی خوارەوەی دەبێت.

١. کارتێکەری ڕاستەوخۆی لەسەر ژینگەی گشت جیهان دەبێت.

٢. کارتێکەری ڕاستەوخۆی لە سەر نرخی نەوتی خاو و پاشان گازی سروشتی دەبێت.

٣. کارتێکەری ڕاستەوخۆی لەسەر باری ڕامیاری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەبێت.

لە بارودووۆخی ئەمڕۆدا کارتێکەری ڕامیاری لەسەر ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لە نێو خالی سێیەم دا بۆ ولاتی ئێمە زۆر گرنگە و ئەم هۆکارە کاتێک دێتەئاراوە کە، پاش گەشەسەندنی چاوەڕوانکراوی سالانەی بەرەوپیشەسازی چونی ولاتەکانی چین و هیندستان، ئەم ولاتانە بۆ هەلسوڕانی چەرخی پیشەسازی پێویستیان بە بڕێکی زۆر نەوتی خاو و گازی سروشتی دەبێت و تاکە ناوچەی جیهان کە بتوانێت ئەم بڕە زیادەی نەوتی خاو بخاتە نێو بازاڕەکانی جیهانەوە تەنها ڕۆژهەلانی ناوەڕاستە وە ئێمەش بەشێکی بەرچاوی نێو ئەو هاوکێشانە دەبین.

بە پێی گەشەسەندنی ئابوری ساڵانەی ١٠%ی ئەم دوو وڵاتە لە ئێستاداو بە هەمان شێوەش لە داهاتودا و هەوڵی گشت هاووڵاتیانیان كە ئەوانیش وەكو وڵاتە پیشەسازیەكان (ئەمەریكای باكور، ئەوروپا و یابان) بەهەمان شێوە وزەیان بخرێتە بەردەمیان كە ئەمەش بەواتای هاوردەكردنی هەرچی زیاتری نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، كە ئەم وابەستەی‌یە وزەو ئابوریەش كارتێكەری ڕاستەوخۆی لەسەر باری سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەبێت.

وڵاتی ئێراقیش بە هۆی ئەو گشت زەخیرەی سامانی نەوتی خاو و گازی سروشتیەكەی ساڵ لەدوای ساڵ بەهۆی گەشەسەندنی پیشەسازی وڵاتەكانی چین و هیندستان و هەنگاو نانیان بۆ خۆشگوزەرانی زۆرتری هاوڵاتیانیان پێگەیەكی سیاسی تایبەتی وەردەگرێت. كە ڕاستەوخۆ هەرێمی كوردستانیش بەهۆی زۆری زەخیرەی سامانە سروشتیەكانی دەكەوێتە نێو ئەو چوارچێوە ڕامیاریە ئاڵۆزە پڕبایەخەوە. هەر بۆیەش لە داهاتودا بۆ شكاندنی تینۆتی ئەم وڵاتە پیشەسازیە پێشكەوتوانەی ئاسیا پێویستیان بە ئارامی و سەقامگیری وڵاتی ئێراق هەیە، هەرێمی كوردستانیش دەتوانێت لەپاڵ ئەم ئارامیەو سەقامگیریەی ئێراق لە داهاتودا چوارچێوەی ژێرخانی ئابوری خۆی سەقامگیر بكات.

## ٦.٤ هەڵبژاردنی جێگەیەکی شیاو بۆ پاڵاوگە و وێستگەیەکی پیترۆکیمیاوی

بۆ پەرەپێدان بە تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی پێویستیمان بە چەندین وێستگەی مەزن (پارکی پیشەسازی) هەیە، ئەم وێستگەمەزنانە گشت کردارەکانی پاڵاوتن تا گەیشتن بەبەرهەم لە نێویاندا قۆناغ لە دوای قۆناغ ئەنجام دەدرێت. پێش ئەوەی کە شوێنی پارکی پیشەسازی پیترۆکیمیاوی یاخود وێستگە و پاڵاوگەی پیترۆکیمیاوی (Petrochemical industry park)دیاری بکرێت، دەبێت بە باشی لەم چەند خاڵەی خوارەوە بکۆڵرێتەوە.

- وێستگەکە نابێت لە سەر زەوییەکەی بەپیتی کشتوکاڵی یاخود کێڵگەی نەوت و گازی سروشتی دروست بکرێت،
- پێویستە ئەم وێستگەیە لە نزدیک یەکێک لە کێڵگەکانی نەوتیخاو، یان نزدیکی بۆری گواستنەوەی نەوتی خاو بێت، بۆ ئەوەی بە بێ گرفت کەرەسەی سەرەکی هایدرۆکاربۆنی وێستگەکە بۆ گەیشتن بە بەرهەم یاخود وەرگێڕانی وزە بگاتە نێو وێستگەکە.
- بیرکردنەوە لە گەیاندنی گازی سروشتی بۆ نێو پارکی پیشەسازی پیترۆکیمیاوەیەکە بەهۆی

بۆریەوە (Pipeline). چونکە وەرگێڕانی وزە بەهۆی گازی سروشتیەوە هەرزان و بۆ لایەنی ژینگەش باشەو لە پاشان گازی سروشتی یەکێکە لە کانزاسەرەکیە پێویستەکانی نێو پارکی پیشەسازی پیترۆکیمیاوی.

- ناوچەی هەڵبژێردراو بکەوێتە دەڤەرێکی ئارامەوە کە پارێزگاری لێکردنی سەرمایەیەکی زۆری نەوێت، بۆ نمونە دەبێت لە ناوچە ئاڵۆزە سنوریەکانی نێوان ئێراق و هەرێمی کوردستانەوە دووربێت، واتە قوڵای خاکی هەرێمی کوردستان.
- سەرچاوەی ئاوی شیرینی لێوە نزیک بێت، چونکە ئاو و پاشان هەڵمی ئاو سەرەکیترین و هەرزانترین پێداویستی نێو هەر پڕۆژەیەکی پیترۆکیمیاوین. ئاو و هەڵمی ئاو باشترین و هەرزانترین کانزای گوێزانەوەی وزەی گەرمایین لە نێو وێستگە پیترۆکیمیاویەکاندا.
- ڕووبەری هەڵبژێردراو دەبێت لە ١٠٠ هێکتار کەمتر نەبێت، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بتوانرێت بەهۆی ڕووبەری نێو پارکی پیشەسازیەکەوە، سەرمایەگوزارانی دەرەکی بیانی لە بواری پترۆکیمیاویدا بکێشینە نێو چوار چێوەی کاری وێستگە پیترۆکیمیاویەکەوە. گرنگی بەرفراوانی

شوێنی گونجاو بۆ ئەوەیە، چونکە زۆربەی ڕووبەری نێو ئەم پارکی پیشەسازی پیترۆکیمیاویە لە کۆمەڵە شلدانێکی (Storage Tanks) مەزن پێکدێت کە بەرهەمەکانی تێدا پاشەکەوت دەکرێت:

- Crude oil tank farm
- Component tankage
- Finished products tank farm

بۆ ڕونکردنەوەی زیاتر بڕوانە وێنەکانی، ٦.١٨ و ٦.١٩ خوارەوە: لەم وێنانەدا بەشێکی زۆر لە ڕووبەری نێو وێستگەکە تایبەتە بە شلدانەکان، کە گشت قەبارەیەکی جیاوازیان تێدایە.



وێنەی ٦.١٨: گرنگی بەشی پاشەکەوتکردن لە نێو وێستگەیەکی پیترۆکیمیاویدا



وێنەی ٦.١٩: گرنگی بەشی شلدانەکان لە نێو وێستگەیەکی پیترۆکیمیاویدا

- دەڤەری هەڵبژێردراو دەبێت لە جادەی هاتوچۆوە نزدیک بێت، بۆ ئەوەی لە داهاتودا بتوانرێت بە شێوەیەکی ئاسان بەرهەمەکانی لە ڕێگەی بۆری (Pipeline) یاخود تانکەر (Tanker Truck)، هێڵی ئاسنە وە بگوازرێنەوە نێو بازاڕەکان.
- دەبێت دەڤەری هەڵبژیردراو نزیکی شارەگەورەکان بێت. چونکە بۆ ڕاپەڕاندنی گشت کاری ئەندازیاری و خزمەتگوزاری تر ئەم وێستگەیە پێویستی بە توانای

فکری و ئاستی ڕۆشنبیری مرۆڤەکان لەو شارەدا دەبێت. نزیکی لە شارەوە ئەو دەگەیەنێت کە بتوانرێت بە شێوەیەکی هەرزان کرێکار و ئەندازیاری شارەزا بۆ کاری پێویستی نێو وێستگەکە دابینبکرێت. هەروەها پرۆژەیەکی ئاوەها سودی بۆ شارەکەش دەبێت لە داهاتودا لە باری نەهێشتنی بێکاری و بوژاندنەوەی پیشەسازی کە ئەویش خۆی لە ڕاکێشانی سەرمایەدا دەبینێتەوە.

- لە سەرەتادا بۆ بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان ئەم بەرهەمانەی وەکو، بەنزین، کیرۆزین، دیزل و ئیسفالت و ڕۆنی سەیارە و نەوتی سوتاندنی نێو پالاوگەکە گرنگن.

بەلام بۆ بەشی وێستگەی پیترۆکیمیاوی ئەم بەرهەمانەی خوارەوە گرنگن بۆ بەرهەمهێنانی لاستیک و پلاستیک (Propylene, Ethylene)،

چونکە بەهۆی ئەم دووکانزایە دەتوانرێت (Polypropylene, Polyethylene) وەربگێڕدرێت،

واتە کەرەسەی سەرەتایی بۆ دروستکردنی بۆری، زەرفی نایلۆن و قوتوی پلاستک و پێویستیەکانی تری ڕۆژانەی هاوولاتیان.

چونکە هەردەم بەشە پاڵاوتەکانی بواری نەوت و گاز واتە مادەی کیمیاوی تایبەتی نێویان ( Plastics, Materials for clothes (Polyester fabrics, Paints, Chemicals for everyday use ) لەلایەنی ئابوریەوە بەنرختترن و باشترن تا فرۆشتنی نەوت وگاز بەشێوەیەکی خاو.

هەر بۆیەش دەبێت هەماهەنگیەکی باش لە نیوان پاڵاوگەکە و وێستگە پیترۆکمیاویەکاندا هەبێت، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی هاوسەنگ بە پێی پێداویستیە داواکراوەکانی نێو بازاڕ بڕی بەنزین، یاخود کیرۆزینی فڕۆکە لەگەڵ بەرهەمە پیترۆکیمیاویەکانی تر بەرهەمبهێنرێن.

بۆ سەلماندی ئەو ڕاستیەیی کە نرخی بەرهەمەکانی وەچنگهاتو لە نەوتی خاوەوە زۆر گرانترن لە بەرهەمی سەرچاوە سروشتییەکە بە خاوی. لەم لێکدانەوە یەدا نرخی هەر تەنێک نەوتی خاو بە ٥٠٠ دولار مەزەندە کراوە، کە لە ڕاستیدا نرخی ئەمڕۆی نەوتیخاو دوو بەرابەرە.

هەروەکو چۆن لە هێڵکاری خوارەوە ٦.٢٠ دا دەستنیشان کراوە، لە سەرەتادا پاش کرداری تەکنیکی پاڵاوتن نرخی بەرهەمەکانی نەوتی خاو، وەکو، بەنزین، گازوئیل و دیزڵ، توزیك دەچێتەسەرەوە.

پاشان بەهۆی وێستگەی وەرگێڕانی پیترۆكیمیاویەكانەوە نرخەكە بۆ جارێكیتر چەندبەرابەر دەچێتە سەرەوە.




هێڵكاری ٦.٢٠: بەراورد لە نێوان نرخی نەوتی خاو و بەرهەمە پیترۆكیمیاویەكانی

- دۆزینەوەی بازاڕ بۆ بەرهەمەكانی نێو پاڵاوگەكە یاخود بەرهەمە پیترۆكیمیاویەكان. واتە شوێنی دابینكراو دەبێت لە بازاڕی سودلێوەرگرتنی

بەرهەمەکانەوە نزیک بێت، تا سەرمایەی گواستنەوەی بەرهەمەکان کەم بکرێتەوە.

- دابینکردنی شوێنی باش بۆ بەشی بەڕێوەبردن (Administration)، بەشی چاککردنەوە (Maintenance) بەشی ئازمایش (Research Lab)، لەگەڵ کافتریا و بنکەی فریاکەوتنی سەرتایی و ئاگرکوژێنەوە (Firefighting).
- وێستگەی وەرگێڕانی وزەی کارەبا بەهۆی هەڵمی ئاو و گازی سروشتیەوە Gas-Steam Power Plant (Combined Cycle).
- لە ڕوانگەی پاراستنی ژینگەوە لێکۆڵینەوە لە وێستگەی خاوێنکردنەوەی ئاوی نێو وێستگەکە (Wastewater treatment) بکرێتەوە.
- جێگەیەکی شیاو بۆ کۆمەڵە شلدانێکی مەزن بۆ پاشەکەوتکردنی نەوتی خاوی هاتوو لەگەڵ گشت بەرهەمەکانی نێو پارکی پیشەسازیەکە.

## ٧. بیرۆکەی پاراستنی ژینگە لە هەرێمی کوردستان

بۆ پەرەپێدانی ژیان لەسەر ئەم زەوییە مرۆڤ پێویستی بە دوو چوارچێوەی پێکەوە لکێنراوی تەکنۆسفێرە Technosphre و بیۆسفێرە Biosphere هەیە. لە چوارجێوەی تەکنۆسفێرەدا (کە تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی بەشێکە لەو) کانزاکان، ئاو، هەوا و گشت وزەی نێو مادەفۆسیلیەکان هەڵدەلوشرێ تا سەرئەنجام بەرهەم و پاشماوەی لێدەکەوێتەوە. بیۆسفێرە ئەو چوارچێوە یە کە مرۆڤ، گشت شینایی و گیانداران ژیانی تێدابەسەر دەبەن. هەوا، ئاو و خاک بنەماکانی خوڵقاندنی ئەم چوار چێوەیەن.

کەواتە بۆ پەرەپێدانی ژیانی مرۆڤ لە سەر زەوی پێویستیمان بە پارێزگاریکردن و پەرەپێدانی ئەو دوو چمکەی سەرەوە هەیە و دەبێت چوارچێوەی بیۆسفێرە لە دۆخی سروشتی خۆیدا بهێڵینەوە، چونکە مرۆڤ بۆ پەرەپێدان بە ژیانی خۆی پێویستی بە ژینگە هەیە بەڵام ژینگە پێویستی بە مرۆڤ نی یە.

ئامانجی یاسای پاراستنی ژینگە لە نێو بیرۆکەی بەڕێوەبردنی تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاوی لە هەرێمی کوردستاندا دەبێت ئەوە بێت کە لە ئەنجامی کاری بەرهەمهێناندا ژینگە یاخود چوارچێوەی بیۆسفێرە (ئاو، هەوا، خاک) لە پۆخەڵی بپارێزرێت. هەروەها دەبێت

مەبەست لە یاسای دوبارە سودلێوەرگرتنی پاشماوە (زبڵ) ئەوە بێت کە، گشت کانزاسەرەتاییەکان بپارێزرێن و بەپێی توانا لەلایەن گشت تاکێکی کۆمەڵگای کوردەوارییەوە خوڵقاندن و شاردنەوەی پاشماوە کەم بکرێنەوە.

واتە، چوارچێوەی کاری گشت تاکێکی کۆمەڵگا و مەڵبەندە پیشەسازیەکان ئەوەبێت کە:

١. ڕێگە لە خوڵقاندنی پاشماوە بگیرێت.
٢. هەوڵی دوبارە سودلێوەرگرتنی پاشماوە بدرێت.
٣. شاردنەوەی پاشماوە (زبڵ) لە ڕاستای پاراستنی ژینگە وە پراکتیزەبکرێت.

هەربۆیەش پاراستنی ژینگە بریتیە لە پاراستنی گشت سەرچاوە بنەڕەتیە سروشتیەکان لە مادەزیان بەخشەکان، کە بۆ ژیانی گشت گیانداران لە سەر ڕوی زەوی پێویستن.

لە بیرۆکەی تەکنۆلۆجیایی پاراستنی ژینگە، گشت بنەما پیشەسازیەکان ئاوەها دادەڕێژرێن کە هیچ زیانێکی بەردەوام لە کاتی بەرهەمهێناندا بە سروشتی نەگۆڕی وڵات نەگەیەنرێت. هەربۆیەش ئەرکەکانی پاراستنی ژینگە خۆی لە پیادەکردنی ئەوەدا دەبینێتەوە کە مرۆڤ جگە لە پاراستنی ئەو چوارچێوە سروشتی یە کە بۆ بەرەو پێشبردنی ژیانی خۆی کەڵکی لێوەردەگرێت، بەڵکو پێویستە ڕێگە لە گشت هۆکارەکانی شێواندنیشی بگرێت و هەوڵی گەڕانەوەی ژینگە بدات بۆ شێوازی سەرەتایی خۆیی.

لێرەدا گشت کاردانەوەکانی لەو ڕاستایەدا بێت کە هەر مرۆڤێک لەمرۆکە و داهاتوشدا بە تەندروستیەکی باش لە ژینگەیەکی خاوێندا ژیان بباتەسەر.

لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا ئەو لایەنانە شیدەکرێنەوە کە دەبنە هۆی پۆخەڵی ژینگە و واتە لە هەمان کاتیشدا زیانبەخشن بە گشت گیانلەبەرانیش:

- پاراستنی هەوا لە پۆخەڵی
- پاراستنی ئاو لە مادەزیان بەخشەکان
- ڕێگەگرتن لە دروستبونی دەنگ و ژاوەژاو
- ڕێگە لە دروستبونی پاشماوەو زبڵ

لە ڕاستیدا پاراستنی ژینگە ئەو گشت کردارانەیە کە بەهۆیانەوە ڕێگە لە پیسبونی ئەو چوارچێوەیە واتە بیۆسفێرە (هەوا، ئاو و خاک) لە مادەزیان بەخشەکان بگیردرێت، کە مرۆڤ و گشت گیاندارانی دی لەژێر کارتێکردنی بیرۆکەی ئێڤۆلۆتسیۆن و لە ژێر ڕکێفی مرۆڤدا لە نێویدا ژیان دەبەنە سەر.

بۆ وەدەستهێنانی بەرهەم لە وێستگە و کارگەکاندا، هێزو توانا بۆ مەکینەکان، ڕوناکی نێوماڵەکانمان و کرداری گواستنەوە یان گەرما و فێنکی، ....لەم گشت حاڵەتانەدا پێویستە لە ئەنجامی وزەگۆڕکێ وزە لە کانزافۆسیلیەکانەوە بگۆڕدرێتەوە بۆ وزەی سودمەند و پاشان وەچنگخستنی بەرهەم. لە پاش گەیشتن بە بەرهەم لە سەرئەنجامی ئەم

وزەگۆڕکێیـــە دا پاشـــماوەیەکی بێســـودی زۆر، وزەیـــەکی بێشوماری بەفیڕۆچوو و کۆمەڵە گازێکی زیانبەخش ئاوەڵای ژینگەکەمان دەبێت (بڕوانە هێڵکاری ٧.١).




هێڵکاری ٧.١: پەیوەندی نێوان هۆکارە ناوەندی ودەرەکیەکان لە خانەیەکی بەرهەمهێناندا

دیارە مرۆڤ ناتوانێت بـەبێ بەرهـەم ژیـان بـەرێتـە سـەر. بـــەڵام پێویســـتە بـــە شـــێوەیەکی شـــیاو هاوکێشـــەکانی پەرەسەندنـی کۆمەڵگاو بە پیشەسازیکردنـی وڵات بۆ گەیشتن بـــە بەرهـــەمی زێـــدەتر لەگـــەڵ پاراســـتنی ژینگـــە وەکـــو چوارچێوەیەکی کارکردن لە تـەک بـەردەوامی خۆشگوزەرانی بـــۆ گشـــت نـــەوە یـــەک لـــەدوای یەکـــەکانی کۆمـــەڵگا هەڵسەنگێنرێن. لێرەدایە کە لـە کۆمەڵگایـەکی پێشکەوتوی پیشەسازیدا ڕوبەڕوی پاشماوە (زبڵ) و مادەزیانبەخشـەکان دەبینـــەوە. بـونی ئـــەم مادانـــە لـــە سروشـتدا دەبێتـــە هـــۆی شـــڵەژانی ژینگـــە و ناهـــەمواری ژیـــانی گشـــت گیانـــداران و

خۆنەویستیش کاردەکاتە سەر تەندروستی تاکەکانی مرۆف لە کۆمەڵگادا.

لە پاش گەشەسەندنی بواری پیشەسازی وڵات کارتێکردنی نێگەتیڤ و گۆڕانکاری لە سەر سروشتی ژینگە بە هۆی ئەو هۆکارە فیزیایی و کیمیاویی و تەکنیکیانەی کە دەکرێتەسەری, هۆکارەکانی (تەپوتۆز، میکرۆگیاندارەکان، مادە شیمیایەکان، تیشکەکانی (ئالفا، بێتا، گاما) دەبنەهۆی پیسبونی ژینگە، ئەگەر لە رێژەی هاوسەنگی سروشتی خۆی تێبپەڕێت کە خودی سروشتیش بەهۆی کردارە وەرگێڕانیەکانیەوە لەو توانایەدا نەبێت ئەم پۆخڵییە لە (ئاو، هەوا و خاکدا) بێ کاریگەر بکاتەوە تا دۆخی سروشتی سەرەتایی خۆی بپارێزێت.

لەم بارودۆخەدا کە ئەگەر ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەرێمی کوردستان هەنگاو بەرەو هەرێمێکی سەقامگیری پیشەسازی و بەرهەمهێنەر بنێت، ئەوا دەبێت بەهۆی بنەمایەکی دەستوری رێگە لە پیسبون و شڵەژاندنی ژینگە بگیرێت وە هەوڵی بەردەوام بۆ و دوبارە سودلێوەرگرتنی پاشماوە بدرێت. چونکە پۆخەڵی ژینگە ئەگەر بەم شێوەیی ئەمڕۆکە (لێگەڕی بەمن چی) بڕوات ئەوا لە ئایندەیەکی نزیکدا بەرۆکی گشتمان دەگرێت. بەڕاشکاوی کوردستانێکی ئازاد بەبێ پاراستنی ژنگەکەی هیچ مانایەک نابەخشێ. لە بەرئەوەی کە کاردانەوەی گشت هۆکارە نەخوازراوەکانی دژ بە ژینگە لە دوارۆژدا بەرۆکی گشتمان و بە تەرییش

نـەوەکانـی داهاتومـان دەگرێـت، ئێسـتا بـەو سـەرئەنجامە دەگرین کە هەر تاکێکی کۆمەڵگا دەبێت بەهاوکاری یەکتری ژینگەکـەی خۆمـان گـەر لـە هـەر شـوێنێکی ئـەم نیشمانەدا نیشتەجێ بین، بپارێزین. بیرۆکـەی پاراستنی ژینگـە دەبێت خۆی لـە گشت کردارەکانـی ڕۆژانـەماندا ڕەنگ بداتـەوە.

جوابی لێگەڕی بەمن چی قێزوەنترین هـەوڵی خۆدزینـەوە لە پاراستنـی ژینگـە یـە و ڕێگەخۆشکردنە بۆ مشـەخۆران کـە دیمـەنی جـوان و پـاکی وڵاتەکـەمان بـۆ قـازانجی گیرفانـەکانیان بشـێوێنن. نـەک وەکـی پـڕۆژەی دەسـتوری هـەرێم (مـاددەی ٥٧ خـاڵی سـێهەم) کـە چارەسـەرکردنی پیسکردنی ژینگـە و کەمکردنـەوەیان لـە ئەستۆی حکومـەتی هـەرێمی کوردستانە. هەربۆیـەش دەبێت ئـەم بڕگەیاساییە بەم شێوەیەی خواروەو بنوسرێتەوە.

چارەسـەرکردنی سـەرچاوەکانی پیسـکردنی ژینگـە و کەمکردنـەوەیان لـە ئەستۆی ئـەو لایەنەدایـە کە بۆتـە هۆی پیسبونەکە، نـەک بەتـەنها حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان. بەگشـتیش حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان و گشـت بنکـە بەرهەمهێنە پیشەسازیەکان دەبێت تێبکۆشن بۆ پەر پێدان و پاراسـتی ژینگـە و هـەوڵی نەپسـاوی گشـت تاکـەکانی کۆمەڵگای کوردەواری ئـەوەیە کە ژینگە لە پۆخـەڵی بپارێزن و هەوڵی گەڕانەوەی ژینگە بۆ دۆخی سەرەتایی خۆی بدەن.

وە بۆ بابەتی پاشماوەش پێویستە ئەم بڕگەیەی خواروە لێکۆڵینەوەی لە سەربکرێت. کە پاشماوە (زبڵ) و دوبارە سودلێوەرگرتنی دەبێت بە پێی توانا گشت بنکە پیشەسازییە بەرهەمهێنەرەکان و گشت تاکەکانی نێو کەمەڵگا لە پاشماوە خولّقاندن خۆ دور بگرن وە ئەگەر بە هەرشێوەیەکیش پاشماوە هاتەئاراوە، ئەوا هەوڵی دوبارە کەڵکلێوەرگرتنی بدرێت (نمونە بۆ وەرگێڕانی وزە) و ئەگەر هەر بێسودبێت ئەوا لە کۆتایدا بەشێوەیەکی گونجاو لە ڕاستای پاراستنی ژینگە بخرێتە ژێر چاڵەوە و لە بەین ببرێت.

هەربۆیەش دەبێت گشتمان بە یەك هەڵوێست هاوکاربین بۆ پاراستنی ژینگە بەهەشت ئاساکەمان لەگەڵ سودلێوەرگرتنی وزەی سودمەندی لەبڕنەهاتو لە کوردستاندا.



وێنە ٧.٢: وێنەیەکی پاکیژەی ژینگە و سروشت

بیرۆکـــەی پاراســـتنی ژینگـــە بـــۆ دابینکردنـــی ژیـــانێکی ئاسودەی پایـەدار (sustainable developmen) بـۆ نـەوەکانی ئـەمڕۆ و داهـاتو دا یەکێکـە لـە گرنگتـرین بابەتـە سیاسـیە، ئـــابوری و تەکنیکیـــەکانی ئەمڕۆکـــەی جیهـــان، چونکـــە چارەنوسـی دواڕۆژی گشـت مرۆڤـەکان لـە سـەر ئـەم تاقـە زەویەخاکیـــــەدا بـــــە بڕیارەکـــــانی ئەمڕۆکـــــەی مرۆڤەڕامیاریەکانەوە بەندە. هەربۆیەش ئەوە چەند ساڵێکە کـە لـە نێـو پرۆپاگەنـدەی گشـت پارتـە سیاسـیەکانی وڵاتـە پێشـکەوتوە سـەرمایەدارەکان یـاخود تـا نێـو ئەجێنـدای کۆبونەوەکانی G 8 بابەتی پاراستنی ژینگـە مشتومڕ و پێگـە و گرنگـــی تایبـــەتی خـــۆی پێـــدراوەو شـــرۆڤە دەکرێـــت. پرسیارەکانی پاراستنی ژینگە پەیوەنـدی بەگشت مرۆڤـەکان وە هەیە لە هەرشوێنێک بن لەم جیهانەدا. هەر لە بەر ئـەم هۆیەشە کە پارێزگاری لە ژینگە و بڕیار بۆ سودوەرگرتن لـە وزەنوێبوەکـان لـە نێـو پڕۆگرامـی گشـت پارتـە سیایەکانی جیهانـدا جێگرکـراوە. بـەڵام پڕاکتیزەکـردن و بڕیـاردان بـۆ پاراســـتنی ژینگـــە لـــە وڵاتـــدا ســـەرەتا پێوســـتی بـــە سـەرمایەیەکی زۆر و گـەلێک بڕیـاری ڕامیـاری لـەخۆبوردو هەیـە و پاشـان تـا ئـەوکاتەی بەهۆیـەوە هێـزی کـار لـە نێـو وڵاتدا دەبوژێتەوە.

لەم بابەتەدا ئەو هۆکارانە شیدەکرێنەوە کـە پاڵنـەرن بـۆ پاراستنی ژینگە لە هەرێمی کوردستاندا.

### * هەست بەبەرپرسیارێتی کردن

شیکردننەوەی ئەم چمکە بە پەندێکی پێشینیانی ئەڵمانی دەستپێدەکرم کە ئەویش:

Die geteilte Verantwortung ist keine Verantwortung

لە بەرپرسیارێتی دابەشکراودا، هیچ مانایەکی بەرپرسیارێتی نامێنێت، کەواتە، هەست بە بەرپرسیاریکردن دەتوانرێت وەکی چمکێکی ئاڵۆز شرۆڤە بکرێت بەڵام زۆرن ئەو مرۆڤانەی کە لە زۆر شت یاخود مرۆڤ بەرپرسیارن بەڵام بەداخەوە ئەوان گێلانە یاخود زانایانە خویان لە واتاکەی دەشارنەوە.

فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەڵمای واڵتەر ک. تیسمەرلی هەوڵ دەدات کە چمکی هەست بە بەرپرسیارێتیکردن شیبکاتەوە، کە گوایە: هەست بە بەرپرسیارێتیکردن واتە، مرۆڤ ئەو کەسەی کە ئەبێ خۆی بە بەرپرسیار بزانێ بەرانبەر بەوشتەی یاخود ئەو مرۆڤەی کە ئەو لای خۆی، خۆی بەخاوەنی دەزانێ.

واتە ئەگەر مرۆڤ بەڕاستی خۆی بەرانبەر بەشتێک، بیرۆکەیەک یاخود مرۆڤێک بە بەرپرسیار زانی ئەوا پێویستە خۆی بەئاگابکات کە چ هۆکارێک لە ئاییندەدا بەهۆی ئەو بەرپرسیارێتی ئەوەوە دێتە ئاراوە، لەهەمانکاتیشدا خۆی لە ئەنجامەکانی هەمان کاردانەوە بە بەرپرسیار بزانێت. واتە مرۆڤی بەرپرسیار پێویستە لە

سەرەتادا لە بەرپرسیارێتیەکەی خۆی و لەگەڵ گۆڕانی کاتدا بە هەماهەنگی لێکدانەبڕاو بکۆڵێتەوە.

بۆ نمونە مرۆڤێکی سیاسی خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت بەرانبەر بە بڕیارێکی خۆی کە ئەبێتە هۆی خوڵقاندنی ڕوداوێکی تایبەتی لە دوارۆژدا، ئایا پاش ٥٠٠ساڵی دی، مرۆڤ دەتوانێت هەمان سیاسەتمەدار لە سەر ئەو کردارەی کە گوایا لە ئەنجامەکانیشی بەرپرسیارە بکێشێتە ژێر پرسیار و وەڵام. بە شێوەیەکی زانستی پێویستە مرۆڤ لەمرۆکەدا لەو کردارانە و بڕیارانەی کە لە ئاست ژینگەکەمادا دەکرێن و دێنە ئەنجام، بەهەمان لێکۆڵینەوە و بەرپرسیارێتی لە گشت کاردانەوەکانی بۆ سەر نەوەکانی داهاتوی وڵاتەکەمان بکۆڵێتەوە.

واتای دەقاودەقی بیرۆکەی هەست بە بەرپرسیاریکردن بەتایبەتی بۆ ئەو مرۆڤە سەرمایەدارانەیە کە بە هۆی کارگەی بەرهەم هێنانەکانیانەوە بەڕێژەیەکی بەرچاو لە پیسبونی ژینگەکەماندا دەستیان هەیە. کەواتە دەبێت ئەوان لە تەنیشت پەرەپێدان بە ڕێگەگرتن لە پۆخەڵی ژینگە لە ئەنجامی بەرهەمهێنان لە گارگەکاندا، هەوڵ بدەن بەکرداری، چاندنی دارستانەکان، شوێنی گەشت و گوزار لە تەنیشت کارگەکانیانەوە، ناوچەی ئارام بۆ گیانداران، ژینگەکەش ببوژێننەوە.

### * دابینکردنی ژیانێکی باش بۆ داهاتو

بەهۆی کردارەکانی پاراستنی ژینگەوە ڕێگە لە هاتنەئارای گۆڕینی کەش و هەوا، وشکەساڵی، بێ پیتی زەویوزاری کشتوکاڵی، یاخود کۆمەڵە بەڵایەک و دژواریەکی بێ ئەندازە دەگرین کە لەمڕۆکەو هەروەها لە دواڕۆژیشدا ئاوقەی نەوکانی داهاتومان دەبێت. چونکە ژینگەیەکی ئارام و ڕازاوە باشترین دیاریە کە ئێمە بۆ نەوەکانی داهاتومانی بەجێ دەهێڵین.

### * بانگێشە بۆ پاراستنی ژینگە

خودی خۆمان و پاشان گشت دامودەستگاکانی ڕاگەیاندنی هەرێم بەگشتی و بەڕێوبەرایەتی ژینگەش بەتایبەتی دەبێت هەوڵی بەردەوام بدەن بو بانگێشە بۆ پاراستنی ژینگە، کەواتە پاراستنی ژینگە لە لای کۆمەڵگایەکی هوشیار یەکێکە لە پتەوترێن کۆڵەکە نەگۆڕەکانی دەسنیشان کردنی ئاستی ڕامیاری وڵات و واتە لە لایەن حکومەتی هەڵبژێردراویشەوە یەکێکە لە هەرە بنەما نەگۆڕەکانی ڕێگەدان بە ئەنجامدانی گشت پڕۆژەیەکی ئابوری و پیشەسازی لە وڵاتدا.

*** گێڕانەوەی سەرمایە بۆ ڕێگەگرتن لە بێکاری و هاتنەئارای یەکسانی سەراسەری**

بەهۆی جێگیرکردنی بیرۆکری پاراستنی ژینگەوە لە نێو یاسای سەرمایەگوزاری و پەرەپێدانی ئابوری هەوڵی وەگەر خستنی سەرمایەو واتا بۆ پاکوخاوێن ڕاگرتنی ئاو، خاک و هەوا لە هەرێمی کوردستاندا دەبێت هەوڵی کڕینی هێزی کار لە لایەن سەرمایەدارانەوە بدرێت واتە دەبێت هێزیکار بخولقێنرێت، سەرئەنجام دەتوانرێت بە پاڵ پاکژی ژینگە، چارەسەری خراپترێن و قیزەوندترین دەردی کۆمەڵگا کرا کە ئەویش بێکارییە، ئەم ڕاستیە لە گشت وڵاتە ئەوروپایەکانەوە سەلمێنراوە، کە خەڵکانێکی زۆر لە بواری پاراستنی ژینگەو وەرگێڕانی وزەنوێببوەکاندا کاردەکەن و ئەم ڕێژەیەش هەردەم لە هەڵکشاندایە.

*** ئارامش واتا خۆ پاراستن لە قەیرانەکان**

بیرۆکەی ڕێگەگرتن لە خولقاندنی قەیرانەکان، کۆچی بە کۆمەڵ لە لادێ کانەوە بۆ شار و لەم وڵات بۆ ئەو وڵاتی تر، وشکە ساڵی و هاتنەئارای برسێتی لە ئەنجامی بێپیتی زەویە کشتوکاڵیەکان، مردنی دارستانەکان (کە لێرەدا تەنها مەبەست زیان گەیشتن بە دارستانەکانە)، پیسبونی یاخود دابەزینی ئاوی ژێرزەوی و هاتنە ئارای وشکی کێڵگەکان گشتیان دەتوانرێن خۆمانی لێ بەدور بگرین کە کە ئەگەر گشتمان ڕێگە لە شڵەژاندنی ژینگە دەگرین.

*** پارێزگاری لەو کاڵایەی کە گشتمانی ئەمڕۆکەو نەوەکانی داهاتوش خاوەنینی**

لە بەرئەوەی کە کاردانەوەی گشت هۆکارە نەخوازراوەکانی دژ بە ژینگە ئەمڕۆ و لە دواڕۆژدا بەرۆکی گشتمان یاخود نەوکانی داهاتومان دەگرێت، کەواتە بەو سەرئەنجامە دەگەین کە هەر تاکێکی کۆمەڵگا دەبێت بەهاوکاری یەکتری ژینگە کە ئەگەر لە هەر شوێنیکی ئەم نیشمانە دا بین بپارێزین واتە بیرۆکەی پاراستنی ژینگە دەبێت وەکو پەیمانێکی نیشتیمانی خۆی لە گشت کردارەکانی ڕۆژانەماندا ڕەنگ بداتەوە.

لە ئەم پەندە کوردیە دا گرنگی بابەتەی ژینگەی کوردستان بەجوانی شیکراوەتەوە، چونکە ئێمەی کورد بە گشت نەوە یەک لەدوای یەکەکانیەوە هەردەم ئەم ڕستیەمان گوێ لێدەبێت و دوپات دەکرێتەوە، کە گەلی کورد لە شاخەکان و سروشتی کوردستان زیاتر هیچ دۆستیکمان نییە لە جیهانەدا، زۆر جاریش مێژووش شاهیدی ئەم پەندە دەدات، جاباشە گەلو وەرن با ئیمە ئەم تاقە دۆستەی خۆمان بۆ ماڵی دونیا زویر نەکەین و هەرئاوەها بە جوانی و پاکیژەیی بە ئەمانەتێکی کورد پەروەرانەوە بۆ نەواکانی داهاتومانی بەجێبهێڵین.

## ٨. سەرئەنجام

ئەوە نزیکەی قەرنێکە کە نەوتی خاو و پیشەسازیەکەی هاتۆتە نێو وڵاتی ئێراقەوە و تا ئێستاش گشت پایەکانی سیاسی و ئابوری ئەم وڵاتە بە فرۆشتنی ئەم سەرچاوە سروشتییەوە بەندەو ساڵانە بەرنامەی ئابوری وڵات لە سەر فرۆشتنی داهاتی ئەم سامانە دادەڕێژرێت. بۆیە تا داهاتویەکی دورودرێژیش کارتێکەری ئەم وزەیە و پارەی فرۆشراوی لە سەر گشت بوارەکانی سیاسی و ژیانی ڕۆژانەی هاوڵاتیانی دەمێنێت و هەر گۆڕانکاریەک لە دارشتن و پراکتیزەکردنی بەرنامەکەی یەکڕاستە کارتێکەری لە سەر گشت بوارەکانی ژیانی سیاسی و ئابوری وڵات دەبێت.

بەهۆی دارمانی ژێرخانی ئابوری وڵاتی ئێراق لە ئەنجامی شەڕە یەک لەدوای یەکەکان گشت بنەماکانی توانای مرۆڤیی، پیشەسازی ، گەشتوگوزار، کشتوکاڵی و ئاژەلی ئەم وڵاتە لە ئاستێکی زۆر دارماو شپرزەدان. بۆ بوژاندنەوە و بەرەوپێشبردنی ئەم بوارانە لەم وڵاتەدا پێویستیمان بە کاتێکی دەیان ساڵە و سەرمایەیەکی زۆر هەیە، تاکە دەرەتان بۆ گەیشتن بەو سەرمایەیە تەنها لە ڕێگەی فرۆشتنی نەوت وگازی سروشتی یەوە دەبێت لە بازارەکانی جیهاندا. لێرەدا گرنگی نەوت وبەرهەمەکانی بۆ

ئێمە و نەوكانی داهاتو ڕوندەبێتەوە. بۆیە گرتنەبەری هەر سیاسەتێكی ناڕاست كە پەیوەندی بە كەرتی نەوتی خاو وگازی سروشتیەوە هەبێت دەرئەنجامە چەوتەكانی زۆر كاریگەر دەبن بۆ ئایندەی ئەم وڵاتە بەگشتی. ئەوشمان لەبیر نەچێ ئەبێت بیر لە ڕێچكەیەك بكینەوە كە تەنها بۆ بوژاندنەوەی پیشەسازی و گشت بوارەكانی تری وڵات سود لە سامانی نەوت وەربگرین وە بنەمایەك بۆ ئایندە دارێژین كە لەسەر فرۆشتی ئەم بەرهەمە لە بڕهاتوانە دانەڕێژراو بێت.

نەوتی خاو لەگەڵ گازی سروشتی پێكهاتون لە كۆكتێلێكی زنجیرە درێژی هایدرۆكاربۆنی كە لە هەزارەها بەرهەمی جیابەجیا دروست بون، كە لە پاش پاڵاوتنی ئەم وزانە لە نێو پاڵاوگەكاندا دەتوانرێت لێوەیان هەزارەها بەرهەمی هایدرۆكاربۆنی بێتەدی. بۆ وەدەستهێنانی بەرهەمەكانی دی پێویستە سەرەتا گشت پەیوەندیەكانی هایدرۆجین و كاربۆن بە پێی ژمارەی كاربۆنەكان بە شێوەیەكی پوختە بەهۆی ژمارەی كاربۆنەكان و پلەی جیاوازی هەڵمبون و لینجی (Boiling Point ,Viscosity) بەرهەمەكانەوە لە یەكتری جیابكرێنەوە، پاشان دەتوانرێت لە وێستگە كیمیاویەكاندا بەپێی پێویستی تەكنۆلۆجیای ئەو وڵاتە بەرهەمەكان پێكبهێنرێن.

نەوتی خاو لەگەڵ گازی سروشتی دینەمۆی وەرچەرخێنەری تەکنۆلۆجیا و ئابوری و گرنگترین وزەی سەرەتایین لەسەر ڕوی زەوی. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پێویستی وڵاتە پیشەسازیەکان بە سامانی سروشتی نەوت و گاز بەرەو سەرێ هەڵدەکشێ، چونکە گرنگی نەوتی خاو و لەگەڵ گازی سروشتی لەوە دایە کە جگە لەوەی کە خاوەنی وزەیەکی پاشەکەوتکراون کە لە ئەنجامی سوتاندیاندا ئازاد دەبێت، کە سەرچاوەیەکی بەهێزی وەرگێڕانی وزەیە، وەکو وزەی کارەبا یاخود بەنزینی سەیارە، لەهەمانکاتیشدا لە چوارچێوەی وەرگێڕانیاندا لە وێستگە پیترۆکیمیاویەکان دەتوانرێت بە هۆیانەوە هەزارەها کەرەسەی بەنرخ (وەکو لاستیک و ڕەنگ، پەینی کیمیاویی، داو دەرمان و جلوبەرگ، Oil for every use) کە بۆ ئاسانکاری ژیانی مرۆڤ بەرهەبهێنرێن.

لە ئەمریکادا هەر نەفەرێک ڕۆژانە پێویستی بە ١٠ لیتر نەوت هەیە و لە وڵاتەکانی ئەوروپادا تەنها پێویستیان بە ٥ لیتر هەیە و لە زۆربەی وڵاتەکانی دی تەنها نیو (٠،٥) لیتر ڕۆژانە بەکار دەهێنرێت. هەر بۆیەش بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە دەبێت نەوتێکی زۆر بە تایبەتی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە بخرێتە نێو بازاڕەکانی دونیاوە، هەر بۆیەش ئەم دوو سامانە سروشتیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەنرختردەبن. کەواتە تا ئایندەیەکی چەند ساڵە ئێمەش لە هەرێمی کوردستاندا هەروەکو گشت وڵاتانی دراوسێمان دەبێت بۆ

بەرەو سەر بردنی باری خۆشگوزەرانی هاوولاتیان و بە پیشەسازیکردنی وڵات بە هێنانەناوەی سەرمایە بەهۆی فرۆشتنی نەوتی خاو و گازی سروشتیەوە وابەستە بین.

ئێراق هیچ خاوەنی دوەمین زەخیری ژێرزەوی نەوتی جیهانە لە هەمان کاتیشدا نرخی تێچوی هەربەرمیلێک نەوتی بەرهەمهاتو لەم وڵاتەدا لە نزمتین ئاستی دونیادایە، چونکە زۆربەی زەخیرە ژێر زەوییەکانی لە قوڵاییەکی کەمدان.

بەهەمان شێوەش نەوتی خاوی کوردستان لە بەراورد لەگەڵ نەوتی وڵاتانی دی گەلێک سوکترە واتە پێویستی بە کاری پاڵاوتن کەمترە، واتە بەرهەمە پیترۆکیمیاویەکانی گەلێک هەرزانتر دەکەوێت، لەلایەکی ترەوە هەرچی نەوتی باش و سوکی وڵاتانی دی هەیە گشتی دەرهێنران و فرۆشران ئیتر ئێستا خەریکی پالاوتنی نەوتی قورس و پڕ پەیوەندی گۆگردن. بەڵام نەوتی کوردستان (جگە لە نەوتی ناوچەی بابەگوڕگوڕی کەرکوک) بەهۆی ئاڵۆزی سیاسی ناوچەکە، بڕیاری سیاسی شۆڤێنیانەی ناوەندی و بێتوانایی پیشەسازی وڵاتی ئێراقەوە، تا ئێستاش هەر لە ژێر چاڵەکاندایە و چاوەڕوانی دەرهێنان دەکات.

بەهەمان شێوەش لەلای گشت وڵاتانی خاوەن گازی سروشتیەوە سەرچاوە شیرین و پڕبەهاکانی گازی نێو وڵات هەڵهێنجراون و فرۆشراون، بەڵام لە هەرێمی کوردستاندا

ئێمـە خـاوەنـی کۆمەڵـە کێڵگەیـەکی گرنگـی گـازی شـیرین و پڕبـەهاین. بـە پێـی ئـەم لێکدانەوەیـە دەتـوانین ئێمـە ئـەم تایبەتمەندیانــەی گـــازی شـــیرین و نـــەوتی خـــاو لـــە هەرێمەکەماندا وەکو دوو سەرچاوەی پەرەپێدانی پیشەسازی و پیترۆکیمیـاوی سـودی لێـوەرگرین و هەرێمەکـەمان گەشـە پێبدەین.

هەرچەندە بەگشتی ئـەم وزە فۆسیلیانە لـە بڕهـاتون، کـە هاڕۆژێک دێ کۆتاییان دێت، بەڵام لە بەر ئەوەی کە دەوامی ســودلێوەرگرتنی ئـــەم وزەســـەرەتاییانە بەتایبـــەتی لـــە هەرێمەکەمانـدا تـا چەنـد سـەد سـاڵێکی تـر بـەرگـەدەگرن، کەواتــە دەتــوانین بـــەهۆی بەرنامەیـــەکی داڕێـــژراو وەکـــو پایەیـــەکی نـــەگۆڕی ئـــابوری بـــۆ ســـەقامگیرکردنی ژێرخـــانی ئـــابوری هەرێمەکـــەمان ســـودیان لێـــوەبگرین و بـــەهۆی پەرەپێـــدانی تـــەکنۆلۆجیای پیترۆکیمیاویـــەوە توانـــای پیشەسازی هەرێمەکەمان بەرەو سەرێ بەرین.

ئـەمڕۆ وڵاتـانی نێـو ئورگـانی ئۆپێـک نزیکـەی ٣٦ ملیـۆن بـەرمیل لـە ڕۆژێکدا بـەرهەمدەهێنن [١٨].

هەڵسوڕێنەری چەرخی تەکنۆلۆجیا بەتـەنها نـەوتی خـاوە و سـاڵ لـە دوای سـاڵ پێویسـتی تـەکنۆلۆجیای گشت جیهـانی پیشەســازی بــە نــەوت بــەرەو ســەرێ هەڵدەکشێت و تاکــە ناوچەیـەک کـە بتـوانێ بـەهۆی زەخیـرەی ژێـرزەوی سـامانە سروشـتییەکانیانەوە تـونێتی ئـەو تەکنۆلۆجیایـە بـە نـەوت

پشکێنیێ، تەنها ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. لە نێوان گشت وڵاتەکانی نێو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا تاکە وڵاتێک کە بتوانێ تواناى دەرهێنانی خۆی چەند بەرابەر بکات، وڵاتی ئێراقە بەهۆی ئەوەی کە خاوەنی زەخیرەیەکی زۆری سامانە سروشتییەکانی بێ ئەندازە و توانایی مرۆڤی گەورەشە. کەواتە گشت جیهانی پیشەسازی چاوەڕوانی وڵاتی ئێراقن کە ئەم گێژاوی گرانی وزەو کەمبونەوەی نەوتی خاو لە نێو بازاڕەکانی دونیا دا بەهۆی بردنەسەرەوە بەرهەمهێنانی چەند ملیۆنی خۆی چارەسەر بکات.

پێویستە کاربەدەستانی ڕامیاری وڵات چاو لە تەجروبەی نەرویج بکەن کە چۆن لەو وڵاتەدا سامانی نەوت کرایە ئامێری بەرەوپیشەسازی وڵات و پاشان خۆشگوزەرانی هاوڵاتیانی، هەربۆیەش دەبێت لە هەرێمەکەی خۆماندا بە پێچەوانەی گشت دراوسێکانمانەوە، نەوت و گازی سروشتی بکەین بە ئامێری بەروە پیشەسازی و دیموکراتی تا بەهۆی ئەم سامانانەوە ئاستی ژیانی دانیشتوانی هەرێم بەرەوسەرێ بەرین. بەڵام گرنگترین خاڵ ئەوەیە کە ئێمە لە هەرێمەکەماندا شان بەشانی دەرهێنان و ناردنەدەرەوەی نەوت و گازی سروشتی لەگەڵ پەرەپێدانی تەکنۆلۆجیای پیترۆکیمایی پارێزگاری لە ژینگەی هەرێمەکەمان بکەین و ڕێگە لە پۆخەڵی ئاو، هەوا و خاک بگرین.

سەرەڕای ئەمانە تا دۆزینەوەی کانزایەکی دی بۆ وەگەڕخستنی هێزو توانای مەکینەی سەیارەکان ئێمەش هەر بە بەرهەمەکانی نەوتی خاوەوە وابەستەین، واتە ئێمەش لە هەرێمەکەماندا تا چوارچێوەی کاری گشت پاڵاوگەکانمان لە نێو هەرێمەکەماندا دانەمەزرێنین و سەقامگیر نەکەین، هەردەم توانای چارەسەری کێشەی بەنزین و گازۆئیل مان نابێت. لە داهاتودا دەبێت کە چۆن ئاو و وزەی کارەبای پێوست بگەیەنینە گشت کونج و کەلەبەرێکی ئەم هەرێمە، بەهەمان شێوەش گازی شیرین بە هۆی بۆریەوە (Pipeline) بگەیەنینە گشت دەڤەرەکانی هەرێمەکەمان.

لە بواری وەرگێڕانی وزەی کارەباشدا بێجگە لە وزەی وزەنوێبوەکان (واتە وزەی وەرگێڕدراوی پاشەکەوتکراو لە ئاوی نێو بەنداوەکانی دوکان و دەربەندیخان بۆ وزەی کارەبا لەگەڵ وزەی نێو دار بۆ وزەی گەرمایی،وزەی تیشکی خۆر) بنەمای وەرگێڕانی وزە لە کوردستاندا لە سەر وزەی وەرگێڕدراوی نێو مادە فۆسیلیەکان دانراوە.

هەربۆیەش بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کارەبا دەبێت تا سەقامگیرکردنی وێستگەکانی بەرهەمهێنانی نەوتیخاو لەگەل گازی سروشتی لەهەرێمەکەماندا هەردەم ئاوقەی کێشەی کەمی کارەبا لە هەرێمی کوردستاندا دەبین. یاخود

بەپێی سیاسەتێکی ڕاستی داڕێژراو بۆ دەستبەسەراگرتنی گشت وزەی کانزا فۆسیلیەکان بەو سەرئەنجامەی کە لە داهاتویەکی نزیکدا گشت وزەی کارەبای وەرگێڕدراو لە هەرێمەکەماندا بەهۆی وزەی نێو وزەنوێبوەکانەوە (ئاو، هەوا، تیشکی خۆر) وەربگێڕین، ئیتر توانیومانە هەم وزەی کارەبا خۆماڵی بکەین و لە هەمانکاتیشدا ژینگەکەشمان بپارێزین.

لە چوارچێوەی ئەم کارانەدا دەبێت بۆ ئاینەدەش هەوڵ بدرێت کە ڕێگە لە بەفیرۆچونی ئەم سامانە سروشتیانە بگیردرێت واتە بە چوستیەکی باش کاری وەرگێڕانی وزە ئەنجام بدرێت و ڕێگە لە بەفێڕۆچونیشی بگیرێت.

واتە لە هەمانکاتیشدا وزەیەکی سودمەنی زیاتر بەرهەم دەهێنرێت، چونکە بردنەسەرەوەی چوستی و کەمکردنەوەی وزەی بەفێڕۆچو لە وێستگەکاندا، ژینگەش لە پۆخەڵی و شڵەژاندن پارێزراوە دەبێت.

هەنوکە لە نێو گشت وڵاتە پیشەسازیەکاندا، پاش ئەوەی بەهۆی بەرەوپێش چونی تەکنۆلۆجیاکەیان لە ساڵەکانی ١٩٦٠ دا ژینگەکەیان بەرەو شڵەژان برد، هەنگاو بەرەو گەڕاندنەوەی ژینگە بۆ دۆخی جاران دەنێن. بەڵام ئێمە دەتوانین لە هەرێمی کوردستاندا سود لە ئەزمونی ئەوان

وەربگرین و لە پاڵ بەرەو پیشەسازیکردنی وڵات ڕێگەش لە شڵەژاندنی ژینگە بەهەشت ئاساکەمان بگرین.

بۆ نمونە تەنها بەهۆی سود وەرگرتن لە گازی سروشتی لە جیاتی نەوتی خاو دەتوانرێت بڕێکی زۆر لە گازەکانی $NO_x$ $CO_2$, CO, VOC کەم بکرێنەوە، کە ئەم کارەش کاریگەری لەسەر ژینگە دەبێت.

سەرئەنجام بەوئاواتەی کە لە داهاتویەکی نزیک لە هەرێمی کوردستاندا گشت تەکنۆلۆجیای دەرهێنان، پاڵاوتن، گواستنەوە و دابەشکردنی کانزا سەرەتای یە هایدرۆکاربۆنەکان بەهۆی کادیرەشارەزاکانی خۆمانەوە لە ژێر ڕکێفی خۆماندا ڕاپەڕێنین و سامانی سروشتی نەوت و گاز خۆماڵی بکەین.

د. قەیوان سیوەیلی
k.siwaily@gmx.de

# سەرچاوەو پەراوێزەکان


[1] Energie Daten 2003, Deutschland

[2] Die Kurden Volk ohne Staat; Günter Deschner, Herbig 2003, S. 200

[3] Peter Hennicke, Michael Müller; Weltmacht Energie, Herausforderung für Demokratie und Wohlstand, S. Hirzel Verlag Stuttgart, 2005

[4] Ferdinand Mayer, Weltatlas Erdöl und Erdgas, Georg Westermann Verlag, 2. Auflage 1976

[5] A consistent and objective series of historical energy market data, BP Statistical Review of World Energy, June 2003

[6] Peak Production and Depletion, Hubbert Diagrams, Developed by M.K. Hubbert 1950s

[7] EIA. International Energy Annual (2004). Short Term Energy Outlook (2007).

[9]www.bio.miami.edu/beck/esc101/Chapter14&15.ppt

[10] (Schweizer-bart`sche Verlagsbuchhandlung BGR 2002)

[11] ASUE, Layout: Fundus

[12] UNO, BP, Shell

[13] www.addaxpetroleum.com

[14] www.dno.no

[15] Workshop on Extractive Industry: Legal & Fiscal Regimes, Revenue Management, & Good Governance, Silvana Tordo, Sr. Energy Economist, COCPO, 2007

[16] Kurdistan Rregoinal Government, Homepage: www.krg.org.

[١٧] چەند لێکۆڵینەوەیەک لە بواری سیاسەتی دابینکردنی وزەو پاراستنی ژینگە لە کوردستاندا، د. قەیوان سوارە سیوەیلی، چاپی نوسینگەی تەفسیر، ٢٠٠٨

[18] http://www.IEA.Com/ , World Energy and Environmental Outlook to 2030, Dr. Fatih Birol, Chief Economist, IEA

[19] World Energy Investment Outlook, Christof van Agt, IEA Office of Non Member Countries, 2003

[20] Amarchand & Mangaldas & Suresh a. shroff & co, by Jatin Aneja, Senior Associate, Production Sharing Contracts Key Contractual Issues, 2004

[21] GDP based on PPP; Source: World Economic Outlook 2006

[22] BP Statistical Review of World Energy (2006)

[23] United Press International, Erbil, Iraq, 30.06.08

[24] Oil and Gas Production in Nontechnical Language, M. S. Raymond and W. L. Leffler, USA, PennWell, 2006

[25] www.westernzagros.com

[26] www.vastexploration.com

[27] Öl und Gas, Im Netz der Konzerne; Gerhard Konzelmann, HERBiG 2006

# گفتوگۆیەک لەگەڵ ئاژانسی هەواڵی فرانس پرێس

**Kurds Flex Muscles over Oil**
Agence France Presse Monday, 19 November 2007

ARBIL, Iraq - Despite a veto from Baghdad, Iraqi Kurds have signed contracts with foreign firms to exploit their huge oil reserves which they vow will benefit the whole country. Strengthened by the autonomy enshrined in the Iraqi constitution, the Iraqi Kurdish authority launched a regional oil policy in August, signing deals with overseas companies, to first achieve self-sufficiency and later exportation.

The authority has signed 20 contracts during the last three months and shows no sign of changing course, despite threats from the federal government to blacklist companies trading with the Kurdish region.
"Iraq has more than 12 percent of the world's crude oil reserves, of which at least five percent is in our region," said Kiwan Siwaily, advisor to Kurdish oil minister Ashti Hawrami.
"The old Iraqi regimes since the 1920s didn't allow us to develop these resources. No student was allowed to study in the oil and gas sector," added Siwaily, just recently back from Germany with a degree in this field.

In the 1970s, gigantic oil fields were discovered in Iraqi Kurdish region but failed to be fully explored. They were never exploited during the reign of Saddam, hostile to the Kurds who resisted his authority.

Since the end of his regime in April 2003, the reserves attracted the attention of international oil sector representatives who traveled to the main city Arbil.

"To export, we have to talk to the central government. But for our domestic use, we don't have to ask anyone. It belongs to us. It's our country," said Siwaily. "We're now producing 20,000 barrels a day. We need 100,000 for our domestic use alone. It's our oil, it's our right."

The federal parliament has been attempting to hammer out a deal regarding national oil policy and to negotiate the delicate issue of sharing resources between the regions. The Shiite majority in the south and Kurdish majority in the north have plentiful oil reserves. But the Sunnis in central Iraq have little oil and insist policy is centralized through Baghdad, an approach not shared by the Kurdish regional authorities but backed by Washington.

US authorities want the oil revenues to be shared equally among the 18 provinces of Iraq. - especially the Sunnis in a bid to wipe out the Sunni-led insurgency against its troops.
The Kurdish authorities are attempting to reassure Baghdad and the other communities that they are happy with rules that restrict them to retaining only the 17 percent of export earnings.

At the federal level, this figure of 17 percent is also the portion of the national budget granted to the Kurdish region.

"We know that if we want to export anything, we'll have to share: 17 percent for us only," said Siwaily. "We have no problem with that."

"They are still discussing this oil law at the federal level. It could take them another two or three years. We're not going to wait. We have lost enough time already.

"Here, we have enough oil and gas for all the middle East. It's our oil, our country. You'll see, we don't need more than two or three years to develop everything and cover our domestic needs."

Among the contracts recently signed, is one for a gas collection and a refinery to supply the electricity station, which experts says make the problem of regional power cuts a distant memory.



## نوسەر لە چەند دێڕێکدا:

قەیوان سوارە محمد ئەمین ئاغا

لە ١٩٧٣ لە گوندی زیبیە سەر بە پارێزگای سلێمانی لە کوردوستانی عیراق هاتۆتە دنیاوە

خوێندنی سەرەتایی:

١٩٧٨ تا ١٩٨٣ خوێندنی سەرەتای لە قوتابخانەی ڕاپەڕین لە سلێمانی

١٩٨٣ تا ١٩٩١ خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی لە شاری سنە لە کوردوستانی ڕۆژهەڵات

١٩٩١ تا ١٩٩٢ تەواوکردنی خوێندنی پۆلی شەشەمی دواناوەندی لە قوتابخانەی هەڵکەوت لە سلێمانی وە بەشداری تاقیکردنەوەی بەکەلۆری.

خوێندنی باڵا:

١٩٩٢ تا ١٩٩٦ تەواوکردنی کۆلێژی ئەندازیاری بەشی میکانیک لە زانکۆی سەلاحەدین لە شاری هەولێر لە کوردوستانی باشوور

٤/١٩٩٩تا ٢٠٠٢/١٢ خوێندنی باڵا ماستەر لە بەشی وزە لە زانکۆی ڕوهر- بۆخۆم لە ئەڵمانیا

(Dipl.-Ing. (Energie- und Verfahrenstechnik - Ingenieur

٢٠٠٣ ٠٦/ تا ٢٠٠٦/٠٦ خوێندنی دکتۆرا لە بەشی ژینگە و ئامادەکاری تەکنیکی (پیترۆشیمی) لە زانکۆی ڕوهر- بۆخۆم لە ئەڵمانیا. (Lehrstuhl für Verfahrens- und Umwelttechnik)

خوێندنی زبان:

کوردی زبانی پاراوی دایک

١٩٨٣ تا ١٩٩١ خوێندن بە زبانی فارسی لە وڵاتی ئێران

١٩٩١ تا ١٩٩٦ خوێندن لە زانکۆی سەلاحەدین بە زبانی عەرەبی و ئینگلیزی

١٩٩٨ تا ٠٦.٢٠٠٦ خوێندن بە زبانی ئەڵمانی لە زانکۆی ڕوهر-بۆخۆم لە ئەڵمانیا

٢٠٠١/٠٥ تا ٢٠٠١/٠٩ خوێندنی زبانی ئینگلیزی لە زانکۆی کاردیف لە وێڵس لە بەریتانیا U. K. (Cardiff-University-Wales).




